(ئەم کتێبە پێشکەشی ئەکەم بە گە نجە موسڵمانەکانی کوردستان)

# نهێنیە کانی کتێبی پیرۆز

محمد حەسەن مامە

٢٠١٠

**كتێب : نهێنیه كانی كتێبی پیرۆز**

**بابەت : ئاینی**

**نوسەر : محمد حەسەن مامە**

**مۆنتاژی ناوەرۆك : نوسەر**

**دیزا ینی بەرگ : سەهەند ساڵح حەمە**

**هەڵەچن: پێشەنگ كاوە**

**تایپ : ساكار ئەحمەد**

**تیرا ژ : ( ٥٠٠ ) دانە**

**نرخ : ( ٣٠٠٠ )**

**چا پی یەكەم : ٢٠١٠**

**ژمارەی سپاردن : لە بەرێوبەرایەتی گشتی كتێبخانە گشتییەكان ژمارەی ( ١٢٣٠) ی ساڵی ٢٠١٠ ی پێ دراوە.**

**چا پەمەنی : چوارچرا**

# بەشی یەکەم

## لەبارەی دەست کاری کردنی کتێبی پیرۆزەوە.

**( ئەگەر ویستان بچنە سەر دینێکی ڕاست سەیری ئومەتەکەی مەکەن بەڵکو سەیری کتێبەکەی بکەن )**

**( محمد حسن مامە )**

# بسم لله الرحمن الرحيم

**پێشەکی :**

**لام وایە لە مێژوی کۆن و نوێدا هیچ کتێبێك هێندەی – کتێبی پیرۆز – قسە و بۆچونی هاودژ و پێچەوانەی یەکتری لە سەر نەکرابێت ، لە لایەن شوێنکە و توانی زۆر بە پیرۆز و تێڕوانینێکی وایان هەیە کە قسە لە سەرکردنی ناوێت ، بەهیچ جۆرێك بواری رەخنە لێگرتن نیە ، لە ولاتریش لە لای بیر مەندان و توێژەرەوان و بە راورد کارانی ئاینەکان .... هتد هێندە شەن و کەو کراوە کەوا یان کردوە مەسەلەی بڕوا کردن بە کتێبی پیرۆز بە هەر دوبەشی کۆن و نوێ وە بڕوا کردنێکە تەنها شوێن کەوتنێکی سۆزگەرایانەیە و هیچ بارمتەیەکی عەقلی و لۆژیکی نیە . لەبەر ئەمە ڕاڤەکاران و پیاوانی ئاینی هەر لە کۆنەوە هەستیان بەمە کردوە بۆیە زۆر خەم ساردانە داوا لە شوێنکەوتوانیان دەکەن کە چاو بنوقێنن و بە دڵ بڕوایان پێبکەن و خۆیان نە دەنە دەست زانست و زانیاری و تەسلیم بەعەقڵ نەبن دەشێت ئەم قسانەیان هێندەی قەبارەی کەسانی سادەبن بەڵام هەرگیز بیرمەند و توێژەرەوەکان بەم قسانە تونیێتیان ناشکێت ،بۆیە مێژوی ئەوروپا چیدی بەرگەی ئەم هەمووخەفە کردنەی عەقڵی نەگرت و لە سەدە جۆراو جۆرەکاندا نارەزایی دەربڕین دژ بە کە نیسەو بیروباوەڕی کە**

**نیسه کەزادەی – کتێبی پیرۆزە – بە جارێك تەقیەوە و لە چەندین شێوازی جۆراو جۆری قوتـا بخانەی هونەر و نوسین دابیّ باوەڕی بووە سیمای قۆناغێکی نوێی ئەوروپا قۆناغێکی ڕزگارکردن لە کۆت و بەندی سەرعەقلّ شپرزەیی دەقەکانی -کتێبی پیرۆز - لە وە بیّ دەسەلاتریون بتوان لە گەلّ ئەو واقیعە تـا زەدابەرخوردبکەن ، بۆیە وەك حالّەتێکی سروشتی تێڕوانین و دەسەلاتی کە نیسە هاتەوە یەك و لە بازنەیەکی بچوکی – ڕوحی – دا قەراری گرت کە سەیری ئم مێژوە دەکەیت ڕاستە قۆلّ کردنی پیاوانی کەنیسە بە قۆلی دەرەبەگە کاندا هۆکار بو بۆ ئەم هاتنەوەیەکە بە لاّم گەر تۆزێك زیاتر بۆی دابچین دەزانیت کە ئەوە خووی کتێبی پیرۆزە توانای وەلاّم دانەوەی خواستەکانی نیەو لە بواری بەراورد کاری دەقەکان و خوێندنەوەی زانستیانەدا ئەوەت پیّ دەلّێن ، کەمێژوی نوسینەوەی و کەسانی نوسەر بە ئالۆزی و نادیاری لە سەرو هەموو ئەمانەشەوە بونی دەیان کتێبی پیرۆز و پاشان بڕیاردان بە تەنها ( شەرعیەت تبونی -٤ - یان جێگای تێرامانەو لە ولاّتی بیّ باوەڕ دانانی ( شوێنکەوتوانی باقی ئینجیلەکانی تربۆ ؟!ئەمانەقسەی زۆر هەلّدەگرن کە خۆستیاری گیانێکی زانستی و دور لە هەلّچون و تەشهیر پیّ کردنەکە دیارە تـا ئەم ساتە کتێبخانەی کوردی ئەو خانەیەی هەر بە بۆشی جێهێشتوە خوێنەری کورد هیچی وای لە بەر دەست دانیە کە ڕومالّێکی ئەو وردە باسانەبکات کە مەبەستە کەچەندە ڕوی خۆم هۆکاری نەبونی ئەو جۆرە باسانە دەگێڕمەوە بۆ زالّ بونی ئەو گیانی لێبوردنەی کە ئیسلام کوردویەتی بەبەر تاکی کوردا سەبارەت بەئاینەکانی ترچونکەوامان زانیەوە گەر زانستیانەش قسە لەسەر کتێبی پیرۆز بکەین ئەوا پەیمانی چاکەکاری لە گەل ئاینەکانی تر کە پێغەمبەر ﴿دخ﴾ پێی داوین لە گەردنی خۆمان دادەمالّین کەئەمەش هەرگیز وانیە چونکە ئێمە بە هەما نجۆر قسەلەسەر قورئانیش دەکەین و ئامادەین لەگەلّ هەر کەسێکدا کە خوازیارە ئەو باسانە**

**بخەینەڕوو . توێژینەوە لێکۆڵینەوەی زانستی بە مافی هەموو کەسێك دەزانین ، دیارە تەشهیرو سوکایەتی پێکردن بۆ خۆمان و بۆخەڵکیش بە کارێکی نا ئەخلاقی دەزانین ، بەلاَم ئەوەی کەدەبیینین پێچەوانەیە مەسەلەی سوکایەتی کردن بە پیرۆزیەکانی ئیسلام هەمیشەلەلای ئەوانەوە بوە چەخماخەی شکاندنی پیرۆزیەکانی بەرام بەر لەلای ئەوانەوە بریسکەی داوە ،ئەمەش ئەوە نیشان دەدات کە پەردە پۆش کردنی کەموکورتی و هاودژەکانی کتێبی پیرۆز دەکەونە شالاَوی تەشهیر کردن بە ڕەمزەکانی ئیسلام بە نوسین و کاری هونەری و فلیم کارتۆن و... هتد تا چەمکی ڕۆشنایەکان لەسەر خۆیان هەڵگرن و بیخەنە پاڵ ئیسلام ،بیَ ئاگا لەوەی ئەم کارە هیچ زیان بە قورئان ناگەیەنێت وبەجدی بونی خۆیان دەکەوێتەوە ژێر پرسیارەوە چونکە زیاد ١٤٠٠ ساڵ قورئان هەر قورئانە بە بیَ کەم و زیاد بونی تاکە پیێشەکیەکیش**

**خوێنەری بەڕێز :**

**ئەم کتێبەی بەر دەستت یەکێکە لە وهەولاَنەی کەدەیەوێت لە میانەی بەراورد کاری دەقە کاندا هەڵەوکەموکورتی و پێچەوانەبون کەلە کتێبی پیرۆزدا هەن لە میانەی خوێندنەوەیەکی خێرادا بخاتە ڕوو کە ئەم قسەیەش لە خۆیەوە ناکات و ڕای ئەم و ئەو وەرناگرێت بەڵکو ڕاستەوخۆ پیَ گەڕانەوە بۆ لایەنی سیێهەم هەندێك لە ڕا ستیەکان دەخاتە ڕوو کەدیار بەم بیرە کەمە ئەو بانگەشە گەورەیەکی دەکەوێت کە گوایە کتێبی پیرۆز –وتەی خوایە –**

**بەهاری ٢٠١٠/٣/٢١**

**محەمەد حەسەن مامە**

# ئینجیل واتای چییە

**ئینجیل واتە (مزگێنی) ئەوەیە کە عیسا (د.خ) مزگێنی پێ دەدا زۆربەی کات دانەرەکانی مزگێنی باسی ڕووداوێك دەکەن کەتیایداعیسا ڕۆیشتوەمزگێنی بدات بە خەڵکی و ئەوەییان پێ ڕابگەیەنێ کە هێناویەتی واتە (ئینجیل)**
**١-وەعیسا بە شارەکاندا ئەگەڕا....وە مزگێنی دەدا بە مەلە کوت وە هەموو نەخۆشی و لاوازیەکی چاك ئەکردەوە**
**٢ -هەر کەسێك خۆی بەدبەخت بکات لە پێناوی من و ئینجیل دا ئەوا سەر فرازی دەکات**

------------------------------

**١-متی ٥٣:٩**

**٢-مرقس ٣٥:٨**

# خوێندنەوەیك بۆ كتێبی كاسۆلیكیەكان

**كتێبی ( DUOAY ) ی ڕۆمانیە كاسۆلیكیەكان بگرە بەدەستەوە و بپرسە : ( ئایا باوەڕت هەیە كە ئەم كتێبە ووتەی خوایە؟ ) مەسیحیەكە ڕائەچڵەكێ و ئە پرسێ ( ئەمە چ كتێبێكە ) ؟ تۆش بیری بێنەوە و بڵێ ( وابزانم ئێوە تەنها یەك كتێبی پیرۆز تان هەیە! ) ئەویش بەچی ئەڵێت :( بەڵێ بەلاَم ئەم دەقانە كامەیانە ؟) لێی بپرسە : ( جیاوازی چییە؟ ) كێشەكە لەوەدایە كە جیاوازی هەیە وەمزگێنیدەری لێهاتوو ئەوە ئەزانێت.بەلاَم ئەو ئەیەوێت بەفێڵ خۆی دەرباز بكات و بانگەشەی بوونی( یەك كتێب ) بكات. كتێبی ڕۆمانی كاسۆلیكیەكان لە( ڕیمز ) لەساڵی ( ١٥٨٢ ز ) چاپكراوەلەلاتینیەوە وسەرلەنوێ لەساڵی ( ١٦٠٩ ) لە ( DUOAY ) چاپكراوە تەوە.بەوەش دەقەكانی ڕۆمانە كاسۆلیكەكان دەبێت كۆنترین دەقەی چاپكراوە كەلەمرۆدائەتوانی بیكرێت.سەرەڕای كۆنێتی ئەم دەقانە بەلاَم پرۆتستانتەكان ئەم دەقانەڕەت ئەكەنەوە و قبوڵی ناكەن لەبەر ئەوەی حەوت كتێبی زیادەی تێدایەكەناوی ئەنێین ئە پوكریفا ( APOCRYP ) واتە : ئەو كتێبانەی كە گومان هەیە لە ڕاستیان.هەموویان ئەوەیان لەبیر كردووە كەلە خەی قەدیس یۆحەننادا هاتووە ( ١٨/٢٢- ١٩..ئەوەی شتێك زیاد بكات بۆ ئەمە ئەوا خوا ئەو لێدانانەی لەسەر زیاد ئەكات كەلەم كتێبەدا**

**هاتووە ئەوەی لە ووشەکانی ئەم کتێبە کەم بکاتەوە ئەوا خودا لە پشکی ئەو لە سەفەری ژیان و شادی پیرۆز و ئەوەی لەم کتێبەدا نوسراوە کەم دەکاتەوە .**
**بەلاّم کێ گوێ بەوە ئەدات ! خۆ ئەوان لەڕاستیدا باوەڕیان نییە پێی چونکە پرۆستانتەکان ئەوەندەچاونەترس بوون حەوت (٧) کتێبی (سفر) یان لە پەڕاوی (خواوەند) یان سڕیوەتەوە کە ئەمانەن:((توبیا ، سفریەهودیت، سفری استیر، نبووە باروك.... تاد)) (١)**

---

١- (ئایا کتێبی پیرۆز وتەی خوایە) لا٢٤

# دەست کاری کردنی کتێبی پرۆتستانتەکان

**(ونستۆن چەرچڵ) لەبارەی ئەم کۆپیە رێپێدراوەوە کەلای پرۆتستانت پێی ئەوترێ دەقەکەی( پاشا جەیمس) (ئەڵێ :دەقە رێپێد راوەکانی کتێبی پیرۆز لەساڵی (١٦١١) بەویست و فەرمانی خاوەن شکۆ جەیمس یەکەم چاپ کراوە کەتاوەکو ئەمرۆش ناوەکەی لەسەر ئەم کتێبە ئەبینی) سەرەڕای ئەوەی کە کاسۆلیەکان باوەڕیان بەم کتێبە نییە بەلاَم بە مەسیحی بووە تازەکان ناچار ئەکەن کە دەقەکەی پاشا جەیمس بکرِن چونکە تاکە دەقێکە کەوەر گێرِدرابێت بۆ (١٥٠٠) زمان لەزمانەکانی وولاتە تازە پێگەیشتووەکان بەمەش یارمەتی پرۆتستانت ئەدەن بۆ بلاَو کردنەوەی ئەم دەقانەئەنجامەکەشی ئەوەیە کەزۆربەی مەسیحیەکان کاسۆلیك و پرۆتستانت.دەقەکانی پاستا جەیمس بەکار دێنن یاخود دەقە رێ پێدراوەکان وەکو هەندێك ناوی ئەنێن.پیا هەڵدانێکی گەرم و گوورِ :ئێستا بابزانین رِای مەسیحیەکان چی سەبارەت بەم دەقانە کە بۆ یەکەم جار لە ساڵی (١٦١١) چاپ کراوە . پاشان ساڵی (١٨٨١) دەستکاری کراوەو ناونراوە دەقە پووختە کراوەکان پاشان لەساڵی (١٩٥٢) زیاتر پوختە کراوەو ناونراوە( R.S.V )دواتر ساڵی (١٩٧١) سەرلەنوێ پوختە کراوەتەوە . ـ لەباشترین ئەو دەقانەی کەلەم سەردەمەدا بەرهەمهێنراوە رِۆ ژنامەی (کلیای) ئینگلیزی یە .ـ وەرگێرِانێکی پوختەی تازەیە لەرِێی کۆمەڵێ زانایی پایە بەرزەوە ئەنجام گەیەنراوە پاشکۆی**

**ئەدەبی (تایمز) .ـسیفاتە باشەکانی دەقە پوختە کراوەکانی لە خۆ گرتووە لەگەڵ وەر گێڕانێکی ڕاست دا رۆژنامەی ( ژیان و کار).ـ وەرگێڕانەکەی زۆر لە ئەسڵی دەچێت (تایمز) .وەخانەی بلاو کردنەوەی (کۆڵنیز) لەتیچبینیەکانی لەمەڕ کتێبی پیرۆزەوە لەلاپەڕەی (١٠) ئەڵێت :(ئەم کتێبە یان بەرهەمی هەوڵی (٣٢) زانای (لاهوت) ە و دەستەیەکی ڕاوێژکار یارمەتی داون کەنوێنەری بە(٥٠) دەستەی ئاینی دەکەن . منیش ئەپرسم ئەم هەموو پیا هەڵدانە بۆ چی ؟بۆ ئەوەیە کە خەڵکی چەواشە بکەن بۆ کڕینی ئەم کالاّ یيە ئەم هەموو شایەتیە کە ئەدرێت بە گوێی کڕیاردا وای لیّ دەکات خۆی بەبراوە دابنیّ ، بەلاّم لەڕاستی دا نازانێت کە گرەوەکەی دۆ ڕاند ووە.** (١)

---

**١- (الحیات العمل).**

**( ئایا کتێبی پیرۆز وتەی خوایە ) ل٢٦**

# قسەکردن لەسەر نوسەرەمەسیحیەکان

کۆمەڵەی ئاینی مەسیحی بەهاوکاری (٣٢) زاناو (٥٠) یەك پێی گەیشتن تێبینیەکی گرنگ هەیە لەکۆتای دەقە پوختە کراوەکانی کولیزا دا لەبارەی (اسفا) ەکانی کتێبی پیرۆز بە (سفر التکوین) دەست پێ دەکەین کە سەفەری یەکەمی کتێبی پیرۆزە : زاناکان لەبارەیەوە دەڵێن : (یەکێکە لە پێنج کتێبەکەی موسا) بڕوانن کە پێنج کتێبەکەی موسا)لەنێوان دوو کەوانەدا نوسراوە ئەوەش ڕێگە یەکی فێڵزانانەیە بۆ دانان بەوەدا کە گویا ئەو قسەی خەڵك کە ئەو کتێبانە هی موسان بەلاّم ئێمە (٣٢)زاناو (٥٠) دەستەی ئایینی وانالێن چونکە لەوە باشتر دەزانین بەدوای(سفرالتکوین) بە دوای چوار کتێبەکەی تردا دێن (سفر الخروج، سفر الاخبار، سفر العدد، سفر تشنیە الاشتراع)... نوسەر زۆربەی کات ئەدرێتە پاڵ موسی وەهەمان شتیان لەبارەی نووسەری (سفر التکوین) یشەوە نوسیوە!

ئەی کێ نوسەری (سفر یشوع) ە وەلاّم ((بەشێکی زۆری ئە درێتە پاڵ یەسووع))

ئەی کێ نوسەری (سفر القصات) وەلاّم ((لەوانەی صموئیل بێت))

ئەی کێ نوسەری (سفر راعوت)؟وەلاّم ((بەوردی نازانرێ کێیە ))

ئەی کێ دانەری ئەمانەیە

صموئیل ١ ( R.S.V ) ....وەلاّم :نوسەرەکەی نەناسراوە .

**صموئيل ٢( R.S.V )......وەلآم : نوسەرەکەی نەناسراوە.**

**سفر (لملوك الاول).........وەلآم :نوسەرەکەی نەناسراوە.**

**سفر (الملوك السانی).......وەلآم: نوسەرەکەی نەناسراوە .**

**سفر (اخبار الايام الاول)...وەلآم : نوسەرەکەی نەناسراوە.**

**لەوانەشە عەزرا کۆی کردبێتەوە**

**سفر(اخبار الايام السانی )...وەلآم : نوسەرەکەی نەناسراوە.**

**لەوانەشە عەزرا کۆی کردبێتەوە .بەم شێوەیە چیرۆکەکە بەردەوام ئەبێت ئیتر دانەری ئەم کتێبانە یان (نەناسراو) یان (لەوانەیە ) یان خاوەنی ئەسڵێکی (گوومان لێکراو) ن: بۆچی لۆمەی خوا بکەین لەسەر ئەم نوشوستیە ئاشکرایە ؟ خوای گەورەش (٢٠٠٠) ساڵ چاوەڕێی نەکردووە تاوەکو زانایانی لاهون دان بەوەدا بنێن کە خوا بێبەرییە لەم هەڵە گەورانەی کە جولەکە کردوویانە ئەوەتا لە قورئانە پیرۆزە کەی دا ئە فەرمووێ (ويل الزين يكتبون الكتاب بايريهم وويل لهم مما يكسبون) بقرت ٧٩ ) ئەگرا هەموو بابەتەکەمان بەم ئایاتە پیرۆزە دەست پێ بکەین و بەوەش وەڵآمی ئەم پرسیارەمان ئەدایەوە کە :ئایا کتێبی پیرۆز وتەی خوایە بەلآم ویستمان فرسەت بدەین بە برا مەسیحیەکان تاکو لە گۆشە نیگایەکی جیاوازەوە ڕاستیەکان ببینن گۆشە نیگایەك کە خاڵی بێت لەخۆ پەرستی و لادان بەلای بۆچونی تاکە کەسیداتاوەکو بەچاوی خۆیان و لە کتێبەکەی خۆیانەوە بەڵگەیان بەر چاو بکەوێ .(١)**

---

**١- (کتێبی ئایا کتێبی پیرۆز وتەی خوایە )لا ١٠١**

**الوجه الاخر للمسيح (فراسالسواح ) عەرەبی**

## کتێبێکی بەر بلاو

ئەو زانایانەی کەچاویان خشاندۆتەوە بەسەر ئەم دەقانەدا : کە فرۆشیاری کارامەن ( قسەی جوان و ڕازاوەیان هەیە لەسەری لە لاپەڕەی سێهەمی پێشەکی چاپە بژار کراوەکەدا ئەیخوێنینەوە :( نوسخەکەی پاشا جەیمس ) زانراوە بە( پایەدارترین دەستکەوت لە پەخشانی ئینگلیزی دا )چونکە ئەوانەی ساڵی ( ١٨٨١ ) بەسەریا چونەتەوە سەرسام بوون بە ساناییەکەی ،بەرزی و هێزەکەی و ئاوازە خۆشەکەی...هەروەها بەرێمە. مۆسیقیەکەی و دەربڕینە شیرینەکانی بەم شێوەیە لە وڵاتە ئینگلیزی زوبانە کان چۆتە پێکهاتە دامەزراوەکانی حکومییەکانەوە ئێمە زۆر قەرزداری ئەو کتێبەین .

## (٢٧) کتێب لە پەیمانی نوێ دا

( العهد الجدید ) داکەمێکی زۆر کەم نەبێت هیچی وەکو وتە عیسا ( د.خ ) قبولّ ناکرێت مەسیحیەکان شانازی دەکەن بە ئینجیل ( مزگێنی ) بەو جۆرەی کە ( مەتتا ) نوسیویەتی و بەو جۆرەی کە( مەرقەس ) نوسیویەتی و بە و جۆرەی کە( لوقا ) نوسیویەتی و بەو جۆرەی کە( یۆحەننا ) نوسیویەتی بەلاّم ئینجیلێك نابینی بەوجۆرەی کە عیسا ( د.خ ) خۆی نوسیویەتی !ئێمە بەدڵسۆزیەوە بڕوامان

**هەیە بەوەی کە هەرچی عیسا (د.خ) وتویەتی سروش بووە لەلایەن خواوە و ئەو ئینجیلە بووە کە بۆ نەوەی ئیسرائیل نێردراوە . بەدرێژای ژیانی عیسا (د.خ) ووشەیەکی نەنوسیوە فەرمانی بۆ کەسیش دەرنەکردووە بە نوسینی ئەوەی کە ئێستا ئەیبینین لە(مزگێنی )ئەوە ئیشی چەند دەستێکی نەناسراوە.ئەو پرسیارەی کە ئێستا لە پێشمانە ئەوەیە(ئایا بڕوات هەیە بەوەی کە کتێبی پیرۆز وتەی خوایە ) ؟**

**لۆقا ١,٢٠**

**زۆربەی کات لەشێوەی بەرەنگار بوونەوەدایە چونکە قسە کە لێرەدا ناگەڕێت بە دوای ڕێ ڕۆشن کردنەوەدا بەڵکو بە شوێن مشتو مڕو بەربەرە کانیی دا دەگەڕێ . لێرەدا مافی خۆمانە کە بەهەمان شێوە بپرسین : (باسی کام کتێبی پیرۆز دەکەین )؟ ئەویش بە بۆڵەوە وەڵامت دەداتەوە بێگومان یەك کتێبی پیرۆز هەی**

## گوێگرتن لەشایەتیە جیا جیاکان

**گراهام سکروچی.لەکتێبەکەی.دا.بەناوی (اهل الکتاب المقدس کلام الرب ) لەلاپەڕەی٢٩ دادەنێت (کاتێك گفتو گۆی لەبارەی ڕاستی و ڕەسەنایەتی کتێبی پیرۆزەوە دەکەین باڕاشکاوانە بڕوێنین چونکە دەبێ گوێ بگرین بۆ کتێبی پیرۆز تابزانین چی دەڵێت لەبارەی خۆیەوە کاتێك گوێ دەگرین بۆ ووتەکانی شایەتێك لەدانیشتنێکی یاسایی دا ئەوا وای دادەنێت کەڕاستی دەڵێت و ئەگەر هیچ بەڵگەیەکی ترمان نەبوو پێچەوانەی ئەوە بیسەلمێنێ دەبێ لێی وەرگرین لەبەر ئەوە پێویستە بوار بدەین بە کتێبی پیرۆز تا بەرگری لەخۆی بکات ئەم**

**داوایە داد پەروەرانەو گونجاوە ئێمەش هەر وادەکەین و ڕێگە ئەدەین بە کتێبی پیرۆز تا لەبارەی خۆیەوە بد وێ... لە پێنج کتێبی یەکەمی کتێبی پیرۆز دا ( سفر التكوين ،الحزوج، الاخبار العد د، تشنيه الاشتراع ) لەزیاد لە ( ٧٠٠ ) حەوت سەد ڕستەدا بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگر هەیە کەخوا ئەو ووشانەی نەنوسیوە یان نەی گووتوە تەنانەت موساش دەستی تێدا نەبووە بۆ ئەوەی ئەمەت بۆ دەرکەوێ تەنها ئەم کتێبانە بە هەڕەمەکی بکەرەوە و ئەم ووتانە دەبینی :**

**( خوا بە موسای ووت............ ) سفر الخروج ١:٦**

**( موسا لەبەدەستی خوا داهاتە قسە .......... ) سفر الخروج ١٣:٦**

**( خواوەند موسای دواند................... ) سفر الا حبارع ١:١١**

**( وەخوا بەموسای ووت.............. ) سفر العدد ١١:١١**

**( پاشان خوا بە موسای ووت ............... ) سفر تشنيه الاشتراع ١٤:٣١**

**لێرەدا ئاشکرایە کە ئەم قسانە نەهی خودان و نەهی موسان چونکە وەکو دەبینین ڕاناوەکە لێرەدا ڕاناوی نادیارە ئەمەش مانای وایە کە ئەمانە وتەی کەسی سێهەمە و ئەو ڕوداوانە تۆمار دەکات کە لەبارەیانەوە بیستویەتی .**

---

**(کتێبی ئایا کتێبی پیرۆز وتەی خوایە ) لا٤٩**

**الوجه الاخر للمسيح ( فراسالسواح ) عەرەب**

# سروشەكەی لۆقا

**بۆمان دەركەوت كە (٨٥٪) ی مزگێنیەكانی لۆقا و مەتتا هی مزگێنیەكەی مەرقسن یاخود دەگەرێنەوە بۆ هەمان سەرچاوەی نادیار (ھ) ئێستاش بابوار بدەین بە لۆقا تا پێمان بلێت كێ سروش (وحی) بۆ كردووە كە چیرۆكی عیسا بۆ(تاوفلیسی دەسەلاّتدار) بنوسێتەوە پێمان دەلێت : كە ئەویش شوێن پێی ئەوانەی پێش خۆی هەلدەگرێت ئەوانەی كەلەو كەمتر بوون و لەبارەی ژیانی عیساوە نوسیویانە وە لەبەر ئەوەی كە پزیشك بووە واتە لەماسی گرێك و باج گرێك گونجاو تربوو بۆ هەستان بەم كارە كەواتە گومانی تێدا نیە كە ئەو شیاوتر بووە بۆ نوسینی شاكارێكی ئەدەبی وەها .. ئەلێ منیش وام بینی پاش ئەوەی لەسەرەتاو دەركم بە هەموو شتەكان كرد كە بە پێی رێز بەند بیانە بەوردی بۆت بنوسم..." ئەمەش پاساوەكەییەتی كە زۆر پێش ئەوانەی پێش خۆی داوەتەوە زانای مەسیحی (.ح.ب) میلبس لە پێشەكی وەرگێرانەكەی دا بۆ مزگێنیەكەی لۆقا دەلێت لۆقا رێی بەخۆی دا كە هەستی بەبەراورد كردنی و پوختەكردنی ئەو نوسراوە ئەدەبیانەی لەبەر دەستیا بوون وە ئاشكراشە كە كۆمەلێ سەر چاوەی تری هەبوو كە ئەو زانیارییانەی لێ وەر گرتووە.**

---

**لۆقا (١: ٣) چیرۆكی عیسا**

**لۆقا (١ :٢)**

# ئایە بەمە دەڵێن ووتەی خوا ؟

**هەوڵبدە کتێبەکەی فیلیبس (مزگێنی ئینگلیزییە تازەکان) تان دەستکەوێت پێش ئەوەی مەسیحیەکان بڕیار بدەن پێشەکیەکەی فیلیبس بەیەك جاری لابەرن وەلاتان سەیر نەبێت ئەگەر پێشەکی دەقە پوختکراوەکانتان بەر چاو نەکەوت چونکە زۆر کۆنن ئەوانە بەرژەوەندیان هەیە لەمەسیحیەت داهەرکاتێك هەست بکەن کەخەریکە دەستەکەیان ئاشکرا دەبیٚ خێرا بەناوی ڕاست کردنەوەی هەڵدەستن بەدەستکاری کردنی بەمەش ئەو ئە نجامانەی ئێستا پێی گەیشتووم و ئەو ڕاستیانەی ئاشکرام کردوون لەماوەی چاوتروکانێك دا ئەی کەن بەڕابردوو ! ئەو مزگێنییەی کەماوەتەوە کیٚدانەری مزگێنی یۆحەننایەبێگومان نە خوداییە و نەیۆحەننا ! بڕوانن بزانن یۆحەننا خۆی لەئینجیلی یۆحەننا(٣٥:١٩) وە (٢١:٢٥) لەم بارەیەوە چی دەڵێی (ئەو) و (ئەویش) کێیە ؟ وەمەبەستی کیٚیە ئیمەزانیمان کاتیٚ کەزانیم ؟ یائەو کەسەیە کەلە بێستانەکەدا جیٚی هێشت کەلەو پەڕی پێویستیٚدا بوو پیٚی ؟ یاخود کەسی چوارهەمینە لەداویەمین ئیچوارەی خواندا ئەو کەسەی کەعیسا خۆشی دەویست ؟ خۆهەردوو کەسەکە هەرناوییان (یۆحەننایە) چونکە لەسەر دەمی عیسادا ئەو ناوە ناوێکی باوبوو لەناو جوولەکەکاندا تەنانەت لەناو مەسیحیەکانی ئێستاشدا باوە ئاشکرایە هیچ یەکێك لەم دووانە ئەم مزگێنییەیان نەنوسیوە دیارە کە ئەویش بەرهەمی دەستانێکی نادیارە.**

# شایەتەکان

**لەناو مەسیحیە شارەزاکاندا لەهەموویان دەنگ بەرزترو دەم بەهاوارتر دەستەی شایەتەکانی ( یەهوە )ن نموونە لەلا پەڕە پێنجی پێشەکی کتێبە پیرۆزە کەیاندا ئەم دانپیانانە دەبینی. لەکاتی کۆپی کردنی نوسراوە ئەسڵییەکاندا لەلایان دەستە وە رە گەزی لاوازی مرۆیی تێکەڵ بەکارەکە بووە لەبەر ئەوە ئێستاکە لەنێوان هەزاران دەست نووسی کتێبی پیرۆز بە زمانە ئەسڵییەکەی دوو دەست نوس نابینی رێك وەك یەك بن ئێستا تێ دەگەین بۆچی هەستان بەلابردنی ئەو پێشەکییە لەکتیبە پیرۆزەکەیان کە بریتی یە لە ( ٢٧ ) پەڕە . خوای گەورە وازی لێهێنان کە بەدەستی خۆیان پەتی سێدارە بخەنە ملی خۆیان لەنێوان ( ٤٠٠٠ ) چوار هەزار دەست نوسی جیاواز دا کە مەسیحیەکان شانازی پێوە دەکەن قەشەکان هەستان بە هەڵبژاردنی تەنهاچوار دەست نوس . لەگەڵ ئارەزووەکانی خۆیاندا دەگوونجا و ناویان نان مزگێنیەکانی مەتتاو مەرقەس و لۆقاو یوحەننا کە هەر یەك لەم مژدانە لەشوێنی خۆیدا تاو توێی دەکەین و شیدەکەینەوە بەڵام ئێستا با ئەو ئەنجامە شیبکەینەوە کەشایەتەکانی (یەهود ) پێی گەیشتوون و لە پێشەکییە وونبوەکە داهەیە .ئەوان دەڵێن (بەڵگەکەش لێرەدا ئەوەیە کە پەیمانی نوێ دەستکاری کراوە هەر وەك چۆن پەیمانی کۆن دەست کاری کراوە ) بەڵام ئەم تاقمە کە چاکردنیان مەحاڵە**

بێشەرمیان گەیشتۆتە ئەوەی لەچاپی یەکەمی کتێبە کەییان بەناوی (ئایا کتێبی پیرۆز بەڕاستی ووتەی خوایە) ؟ کە پێکهاتووە لە (١٩٢) لاپەڕە (٩٠٠٠٠٠٠) نوسخە بلاو بکەنەوە کەواتە ئێمە لەم حاڵەتەدا لەگەڵ کۆمەلێ خاوەن مێشکی نەخۆش داهەڵسوکەوت دەکەین چونکە ئەوان دەڵێن (هەر چەندە دەستکاری کردنی کتێبی پیرۆز زۆر بێت بەلاَم لەگەڵ ئەوەشدا لەڕاستی و ڕەسەنایەتی کتێبی پیرۆز ناگۆڕێت ) ئائەمەییە ژیر بێژی نەصرانیەت.(١)

---

١ - ( : ئایا کتێبی پیرۆز وتەی خوایە )ل٤٨

الوجه الاخر للمسيح (فراسالسواح ) عەرەبی

# دزی ئەدەبی

ئەوەیە کەهەر کەسێك وشە بە وشە نوسراوی کەسێکی تر بگوێزێتەوە ئەمەش خەسڵەتێکی هاوبەشە لە نێوان دانەرەکانی کتێبی پیرۆز دا کە ژمارەیان نزیکەی (٤٠) دانەر دەبێت مەسیحیەکان شانازی بەوەوە ئەکەن کەگوایە ئەم دانەرانە پەیوەستیەکانی روحی ئایا دەبەستێتەوە بە یەکەوە لە دانانی ئەو (٦٦) سفرەدا (بەنسبەت پرۆتستانتەوە) یان ئەو (٧٣) سفرەدا (بەنسبەت رۆمانە کوسۆلیکەکانەوە) ئای چەندە پەیوەستیەکی روحییە ؟ ئەوەتا مەتاو لوقا (یان هەر کەسێك بوویێتن ) هەستاون بە دزینی (٨٥٪) لەکتێبەکەی مەرقەس .چونکە خوای بالاّ دەست هەمان ووتەی نەنوسی وەتەوە بە (الاجمالین) وە مەسیحیەکانیش دان بەوەدا ئەنێن چونکە بڕوایان بەسروش (وحی) وشەیی نییە وەکو ئەوەی موسڵمانەکان بڕوایان پێیەتی سەبارەت بەقورئان بەلاّم دزییە ئەدەبیەکانی کە لە مزگێنیە کانی مەتتاو لۆقادا سانا و بچوکە ئەگەر بەراورد بکرێ بەفڕاندنە ئەدەبیەکان کەلە پەیمانی کۆندا کراوە چونکە ڕێژەکەی گەیشتۆتە (١٠٠٪) لەو کتێبەدا کە پێی ئەڵێین کتێبی پیرۆز و قەشە مەسیحیەکانی هاو شێوەی ئەسقەف (کینی گراگ) ئەم دزییانە بە دەستەواژە نەرمونیانەکانیان ناو ئەنێن (دووبارە بەرهەم هێنانەوە ) وخۆیانی پێوە بادەدەن.

# مەسیحیەت لەڕوانگەی نیچەوە

دڕندەیی هەژێنەری هەڵوێستی نیچە لە دژی مەسیحیەت بەناوبانگە تەنیا بۆ ئەوەی نموونەیەکم هێنابێتەوە سە رنج لەم ڕستانە بدەن ئەگەرئەمرۆ کەسێك لەبارەی پێوەندی لەگەڵ مەسیحیەت دوو پاڵێوبێژی بکاوخۆی لە گێلی بدامن دوایین قامکەکانی هەر دوو دەستمی پێ نیشان دەدەم لێرەدا تاقانە کاری دروست و ڕەوا رەت کردنەوەی رەهایە نیچە هەندێ جار بەشێوەی ئارامی توێژە رانو هەندێ جار بە شێوازی پڕ هەوای مشت و مڕنوسان بەتوڕەیی و سوکایەتی پێکردنەوە دەمامك لە ڕوخساری مەسیحیەت هەڵدەماڵێ کە توارەکانی لەروانگە گەلی سەمەرەی بێ ئەژمار لەقاودەدا ئەولۆژیکی نەیارییەکانی پێشوی هەرس و ڕکێش کردبو و بە سەر چاوەیەکی نوێی دژایەتی لەگەڵ مەسیحیەت کە رەنگە هەرگیز لە رابردودا بەو توند بیە نەبوو و ئاوەهاش لەبەر نجامی بنە تایی کاری خۆی ئاگادارنەببوو کەسانێك کە ئەم سەرکێشی و دوژمنایەتیان ناسیوە لە خوێند نەوەی نیچە سەریان دەسوڕمی رستەگەلێ دەبینن کە لەگەڵ بەشەکانی دژە مەسیحیی کاری ئەو نایەکانگیرن هەم ئەوەتە کەدەنوسێ مەسیحیەت باشترین نموونەی ژیانی ئاید یالییە کەمن لەراستیدا ناسیومە لەمنداڵیەوە ئەو ریگایەم گرتۆتە بەرو پێم وانییە لەدڵمدا جگەلە نەفس بەرزی لەگەلێ رەفتارم کردبێ نیچە بەباشی بەباندۆری کتێبی پیرۆز دەدوێ پاراستنی ڕیزی هەمووان بە کتیێبی پیرۆز تا ئێستا لە ئە ورووپادا

وێدەچیٚ باشترین بەشی ڕازاندنەوەی دابەکانە و ئەوروپیەکان لەم رووەوە منەت باری مەسیحیەتن ئەوچ لە دایك و چ لە باوك مندالٚی بنەمالٚە ئایینیەکان بوو مرۆڤێکی تەواو مەسیحییە سەیترین نموونەی مرۆڤ دەزانیٚ ونوسیی بۆ من شانازییە کە لەبنەمالٚەیەك لە دایکبوم کە بە هەموو واتاییەك لە مەسیحی بوندا تێکۆشەرو کۆڵنەدەر بووە .لەم جۆرە بابەتە پێکنا کۆکانە لەبارەی مەسیحیەت بۆ نموونەلەمەڕ قەشەکان با کەلیسا لە هەموو جێیەك لەقسەکانی نیچەدا هەیە کە دەبیٚ بە هەڵگڕانە چڕوپڕەکانی ئاشکرا بن هەر چەند قسانە شتێکی ئەو تۆ نین نیچە قەشەکانی بە بستە بالأسەر بزێوە فێڵبازەکان و مشەخۆری مرۆیی و خائینانە و سوکایەتی کەرانی خۆ قودسی نوێن بە دنیا و پەسپەسە کوڵانی ژیان و زیت و وورياى دوڕ ئەنقست کار ناودێر دەکردو لەگەلٚ هەموو ئەمانەش دا چەند ین جار لە بیر ئانین و ڕێزلێنانی ڕەفتاری قەشەیی دواوە هەر چەندە کە دەشنوسیٚ لەسەر خەڵك پێویستە کە ئەم چەشنە پیاوانە هەزار جار بەمەزن بزانن و ڕێزیان لیٚبگرن ئەم کەسایەتیە قەشانە میهرەبان و نەرم و نیان و شێلگیرو لە خواترسن و بەشێکن لەخەڵك و لە نێوانیان دا وەکو کەسانی پیرۆزو بژاردەو چەشنی پێد راوێکی خوایی لەڕێگەی خێروخۆشی گشتی ئاخێزدەکەن و خەڵچك دەتوانن لە هێمن و تەناهی دەرگای کونجی شاراوە دڵیان ئاوالأ بکەن ئەو وەها ڕێزێکی لە هەندیٚ قەشەکان دەگرد لە سامە وە نزیکتر دەبوویەوە هەستی دەکرد مەسیحیەت وێدەچێت بەجوانترین بالٚاترین روخسارەکان لەجەرگەی کۆمەڵگای مرۆیی دا بیچمی بەخششیوە واتە پێشەوایانی ئاینی ئاینزای کاتولیکی بایە بەرزو بایە بەرزتر.لەوێدا ڕوخساری مرۆڤ بە ڕێەیەك لە مەعنەویەت و ڕوحانیەت دەگا کە بەرووبومی هەڵلکشان و داکشانی بەردەوامی دو جۆری شادمانییە یەکێکیان هەستکردنە بەهێزو ئەویدی هەسکردن بەخۆبەدەستەوەدان لەوێدا ئەو خۆبەکەم زانیی

**بڵیند لە بەرانبەر لاوازیی جەستەو لەرزۆکی خۆشی مرۆڤ زاڵە کە سەربازی زگماك لەکەسانی دیکە دیارترو بەرزتر دەکا. جوانی ومیرانی کەلیسا بەردەم هەقیقەتی کەلیسا یان لەلای خەڵکی سەلماندووە نیچە لەبەرامبەر مەسیحیان کەهێندە قسەی خراپی پێدەوتن لەبینینی ئەوە کە هەر مەسیحیان لەکتێبەکانی وانەی خۆیاندا نەك عەوداڵی سود بەڵکو سەبارەت بەگشت خەڵك چۆن ڕێگەیان بۆ ساناتر کردنی ژیان للە کردەوەدا نیشان دەدەن زمانی بەمەبەستی پەستکردن دەورو ژا لەگەڵ ئەوەشدا نیچە کەلیسای بە دوژمنی خوێنی هەرشتێکی شکۆمەندو شەریف لە جیهاندا دەزانی بەڕای ئەو کەلیسا سەرترۆپکی بایەخگەلی کۆیلەئاسا. بوو لەتەك هەر چەشنە مەزنایەتی مرۆڤ دەجەنگیٚ و دەرکوت و نوێنەری کەمایەسی و تیا چون بوو هەرگیز لەگەندەڵی و تەفرەدان دەست هەڵنناگریٚ و ڕاناوەستیٚ .وەلیٚ وەلێرەشدا هەم دیس کەلیسا دەسەلاتێك بوو ریزی ئەوی دەوروژاند چۆن دەسەلاتێك ٠ بەم چەشنە گرنگتر لەهەموو ئەمانە کەلیسا ڕێخراوێکی فەرمان ڕەوایە کە مێشکە سەرترەکانی لەسەرەوە دادەنیٚ و بڕوای بەهێزی روح هەیە تا ئەو جێیەی کە هیچ چەشنە ئامرازێکی توندو تیژ گەریی قەبە پەسەند ناکا. هەر چۆنێك بیٚ هەر ئەمە بەسە کە کەلیسا بکا بەدامەزراوەیەکی شکۆمەند تر لە دەوڵەت نیچە ئاگای لەوە هەبوو کەهێزو پتەوی کەلیسا کاتولیك لە کەسایەتیە رووحانی یەکان سەرچاوە دەگریٚ کە تەنانەت ئەمرۆش ژمارەیان کەم نی یە ژیان بۆ خۆیان قورس دەکەن و بەم ئامرازەوە بۆخۆیان واتای پیٚ دەبەخشن وەهانەبوو کەهەر پەلامارێك بۆکەلسا بێتەهۆی ڕەزامەندی ئەو لەشتەکانی دیکە بەربەرەکانی لەگەڵ کە لیسا هەر وەها بەواتای بەربەرەکانی نەفس نزمان و بەرەڵاو ئاسان گیران و ڕواڵەت بینان لەگەڵ حکومەتی کەسانی شێلگیرو قوڵتر و قووڵ روانترە بەگوتەیەکی دی بەر بەرەکانی تورەترینان دێر باوەڕانێك کە ماوەیەکی**

درێژگینگلیان داوەو بە بەدگومانییە درێژەکانی لەبارەی بایەخی هایدن بۆ نموونە هایدن خۆی لەناخدا پەروەردە دەکا ئەم نموونانە بەپێی پێویست پارادۆکسەکانی نیچە نیشان دەدەن هەر هەواڵێك بۆ تێگەیشتن لە نیچە تێگەیشتنی دژو ناتەبای بیژییەکانیئەوی گەرەکە چونکە ئەو پارادۆکسانە ساختە نین بۆ دەستڕاگەیشتن بە لێکدانەوەیەکی واتادار لە هەمبەرێتیگەلی پێکناکۆکی ئەو لەگەڵ مەسیحیەتدا ئیزن بدەن دەستپێك یا خاڵێکی ڕەوانە بوون پێشنیار بکەم راستە کە نیچە پەروەردەی خۆی لەماڵی قەشەیەکی خۆووڵاتی پرۆتستان و نزیکایەتی خۆی لەگەڵ کەسانێك کە یەکانگیر لەگەڵ هیراکانی مەسیحی دەژیان ئێجگار پڕ بایەخە بەڵام هەر کە لەکەمایەسیەکانی مەسیحیەت ئاگاداربوویەوە .ئەونزیکایەتیە لە دیدی ئەوەدا واتایەکی دیکەی پەیدا کرد نایەکان گیری رەسەن لەتەك کەتوار بەردەوام وزەی بزوێنەری مەسیحیەت بووە داخوازە مەحاڵ و کەتوارە سەرکێشەکان بە زۆری دەلوێ شان بەشانی یەك دی بی گوێدان بەیەکدی درێژە بەهەبوونی خۆیان بدەن بەڵام کاتێك کە هەر کام لەمانە لەسنوری خۆی دەست درێژی بکاتە سەر ئەوی دی بەرئە نجامەکە دەلوێ زۆر قەبەو مەزن بێ بەم چەمکە بوو کە نیچە سەرنجی بۆ گومانکاری نێوەکی بوێرانە لەئاڵمان تەنانەت لەنێوان منداڵانی ماڵی قەشەی پرۆتستان راکێشاو هۆیەکەشی لەخۆی پرسی ئەوەی ئەو پەیدای کرد ئەمەبوو کە ژمارەیەکی زۆر لە فەیلەسوفان و دانایانی ئاڵمانی منداڵانی ئامۆژیاران و دواندەران بوونەو بە چاوی خۆیان قەشەیان دیوە و لەئە نجامدا ئیمانیان ئیمانیان بەخوا لەدەست داوە .فەلسەفەی ئەڵمان خۆی لەخۆیدا یەکسانە بەبێ بڕوای بەدینداران و قددیسانی پیپلە دووەم و هەموو قەشەکانی شارو گوند و خاوەن زەویەکان و یەزدانناسان لە زانکۆکاندا ئەم بابەتە نیشاندەری تاییە تمەندییەکی بنەڕەتی لەسۆزو تامەزرۆی نیچە نەیاریی ئەو لەتەك

**کەتواری مەسیحیەت لەگرێدانی خۆی بەبنەچەی مەسیحیەت لە پسان نەهاتویە ئەو خۆی ئەم گرێدانەی بە پۆزەتیڤ دەزانی نەشتێك كە دەبێ بپچڕێنی ئەو ئاگای لەوە هەبوو کەهەژانی رەوشتی مەسیحیەتە کە ویستی ئاسۆ بەرینی ئاراستە كراو بۆ هەقیقەت دەورو ژێنێ و ئێمە زراڤ بینان و ئاستەم پەسەندانی ئەمڕۆیی ئێمە بێ ئیمانان و دانایانی دژە میتافیزیك ئاگری خۆمان كە کۆتەرەیەکەوە وەردەگرین و کەچەندین سەدەی لەمەو بەر بەگروتینی ئیمان هەڵگرا.لەم رووەوە نیچە دەیهەویست هەرشتێکی مەسیحی نەك تەنیا چۆڵەوانی بەڵکو ببیتە کەڵە مەسیحی درکی ئەو لە خۆی ئەمە بوو کەتێ فکرینی لەژێر ئاوزینگی هەژاندنەوەکانی مەسیحیەت گەشەی کردەوە و ئەوەشی وەپشت سەر ناوە بەربەرەکانی لەتەك مەسیحیەت دا بەهیچ شێوەیەك بەمەبەستی وازهێنان یاروخاندن یان هەڵگەڕانەوە لێی نیە نیچە دەیەویست بەسەر مەسیحیەتدا زاڵبێت لێی گوزەر بکات و بەیارمەتی هێز گەلێ کە لە ئێاخنەی مەسیحیەتەوە هەڵقوڵاون نەك هیچ شتێکی دیکە لەجیهان بە ئەنجام دانی ئەم کارە پشت راست بێتەوە نیچە دەڵێ ئێمە ئیدی مەسیحی نین بەلام یەکسەرپاش ئەوە دەڵێ ئەمە سپیتا ئاسایی ئێمەییە کە ئەمڕۆ ووشکترو چەقبە ستووترو سەختگیرتر بووەو ناهێڵێ هێشتا مەسیحی بین ئەو لە سەروی چاکەو خراپەوە لەبەرامبەر هەموو رەوشتەکان بەیداخی نەیاری هەڵدەدا بەلام بەسەمەدێکی ڕەوشتی و بۆ تێپەڕین لە ڕەوشتەکان و دەنوسیٚ هەنوکەکە ڕەوشتەکانیان وردو خاش کردوە دەمانەوێ میراتگرانی بین دەڵێ هەستە رەوشتیەکانی ئێمە بەروبومی لوت بەرزی خوڵقێنی مرۆڤانی ڕابردویە دەڵی هەرچی دەکەین شتێك نیە مەگەر رەوشت کەلەتەك بیچمی پێشوی خۆی کەوتۆتە جەنگەوە هەژاندنە مەسیحیەکان یابەقسەیەکی دیکە دوپات بوونەوەی راستگۆیی لەڕوی ڕەوشتی و تادواین ئاست بەردەوام بەربەرەکانییە کی مەسیحی لەتەك کەتوارەکانی دونیای**

مەسیحیەتی لیٚ کەوتۆتەوە کە نوێنەرەکەی دەسەڵاتی کەلیساو هەبوون و کرداری چەلەنگی هەموو ئەو کەسانە بووە کە خۆیان بە مەسیحی ناو دێر کردووە ئەم بەربەرەکانێیە لەنێوەوەی جیهانی مەسیحی دا هەندیٚ رەنگدانەوەی هەبووە کە نیچە دواین لێکەوتە کانی لەخۆی دا هەستکردوە ئەو لە چاوە ڕوانی دەرفەتی ئەم دیسپلینە مەسیحیە بوو تاخۆی بخاتە کۆشییەوەو نوسیی بەربەرەکانی بەگووشارێکی سەدان ساڵەی کەلیسای مەسیحی تەنگژەی روحی و مەعنەویی هەرەمەزن و بەشکۆی لە ئەوروپا پێکهێناوە کە هاوشێوەی هەرگیز لەسەر رووی زەویەنەبوە کەوان ئێستا وەها کێشراوەتەوە کەدەتوانیٚ دورتر ئاما نجەکان نیشانە بگری ئێمەی ئەوروپییە چاك و راستەقینەکان ئێمە گیانە ئازادو بان ئازادەکان هێشتا لە هەموو شتیٚ خودان هەمووگیانەلاکانی ڕوحو هەموو کێشراناوەی کەوان ین.! ڕەنگە لەتیرووراسپاردەو کیٚ دەزانیٚ تە نانەت ئا ما نجیش بەکورتی لەدیدی نیچە ئەزموونی بنیاتیی ژیانی تایبەتی ئەو واتە بەسەمەدە مەسیحیە کان بوون بەنەیاری مەسیحیەت دەرخەری پرۆسەی جیهان بوو لەسەر بنەمای مێژووی سەدە پەیتا پەیتاکانی وای دەهاتە بەرچاو کەرووداوەکانی سەردەمی ئەو گەیشتۆتە جێیەك کەهەم ئێجگار پڕمەترسییەو هەم ئاوسە بە دەرفەتێکی لە ڕادە بەدەر بۆ روحی مرۆڤ و بۆ بایەخگەلی مرۆیی و بۆ کەتواری مرۆڤبوون تێگەیشتنی خۆی ئەمەبوو کە لەسەر بەندی چونە ژوورەوە بۆ گۆرە پانی مێژووی جیهانە.بۆ بڕینی ڕێگەی ئەم شۆڕشە دەرونییە ناچار دەبین لەچۆنایەتی ڕودانی لەناخی نیچە پرسیاری بکەین دەمانەویٚ مەسیحیەتی ڕەسەن و یەکەمینی ئەو پاشان چۆنایەتی گۆڕانی ببینین دەلویٚ بپرسین کاتێك کە ئەو لە مەسیحیەوە دەبوو بە دژە مەسیحی چ خەباتوو بەربەرەکانێگەلێکی ڕزگاریدەری ئایینی ئە نجام دەدا .بەلاّم لەڕاستی دا هیچ کام لەمانە ڕوینەدا لە بەرانبەردا ولێکەوتەکانی ئەم کەتوارە لەڕووی سەر لەبەری بیرکردنەوەی ئەو

**خاوەنی گرنگی یەکلاکەرەوەیە نیچەلەوەچنگ خستنی سەمەد گەلی مەسیحی بەهەمان شێوە کە هەتا کۆتای لەودا زیندو مایەوە دەستی پێکرد بەلێکدانەوەیەکی دیکە ئەزموونێکی تایبەت بەخۆی لەرەوشت و ڕاستگۆیی بیٚ کۆت و مەرجی وەبەرهێنا بەلاّم هەر لەمندالّییەوە نێوەرۆکە مەسیحی ودەقی هیراکانی مەسیحی و ژێدەر بوونی مەسیحی بەلای ئەوەوە واتایەکی ڕاستە قینەی نەبوو هیچ شتێك تەنانەت هۆگری مندالاّنە بەئەفسانەکان کە پاشان بیەویٚ لەکۆلّیان بکاتەوە نەبوو ئەم چەند نموونەییەی خوارەوە شایەتی ئەم تایبە تمەند یەی تێفکرینی ئەو لەرۆژگاری لاوییە .ئەو لەگەلٚ مەسیحیەت وەکو ئیمانێك لەنیۆرۆکدا و زنجیرەییەك لەبنە واشە دینیەکان هەر لەسەرەتاوە نامۆ بوون دەیووت مەسیحیەت تەنیاو تەنیا حەقیقەتێکی سیمبۆلیکی و مرۆیی یە لە ١٨٦٢ لەهەژدە سالّی دا نوسی هیرا سەرەکی وگشتیەکانی مەسیحیەت تەنیا نیشاندەر و دەربڕی راستیە بنەڕەتییەکانی دلّی مرۆڤە ئەو دیدو بۆ چونانەی کەلەتازە لاویدا بۆ ئەو ڕەخسان لەبنەڕەتدا هەمان ئەوانەن کە پاشان لەفەلسەفەکەیدا دەرکەوتن بۆنموونە ڕزگاری لەسەر کۆلّەکەی ئیمان بەو واتایەیە کە تەنیا دلٚ و نەك زانین بەختەوەری دێنیٚ جەستەمەند بەەنی خوا لەشێوەی عیسا لەوە دەدویٚ کەمرۆڤ دەبیٚبەهەشتی خۆیی لەسەر زەوی دامەزرێنیٚ نەك ئەوەی لە بیٚ بنەتاییدا وەدوای رزگاری بکەویٚ لەهەمان کاتدا ڕستەگەلێکی نوسیوە کە هەوالّی پلا رگەلی داهاتووی مەسیحیەت دەدا لەدنیا ماندو بوون واتەهەمان بەرووبومی دیدگا مەسیحیەکان تەنیا بەر نجامی نارنشکاوی و کەمایەسی وزەی تاکە کەسی و بیانویەك بۆ سیس دەرونانی نامکوڕ لە زالّبوون بە سەر چارەنوس دەزانرێت و بەرتەك دەدرێتەوە نیچە تەنانەت لەتازە لاویدا لەمبارەوە خامەی دەخستە گەڕ کە ئایا تراویلکەیەك دوو هەزار سالٚ لەوەو پێش مرۆڤی فریونەداوەو بەلاڕێیدا نەبردووە و هەمدیس دەلّیٚ**

هەرکەجەماوەر تێبگەن کەسەرتاسەری مەسیحیەت لەسەر ناوێزەکان بنیات نراوە مەودایەکی ئەو تۆیان لەگەڵ ئاژارە گەورەکاندا نامێنێت .بوونی خوا هەرمانی وونی کتێبی پیرۆز خورپە هەموو ئەمانە هەمیشە بەدور لەئەر خەیانی دەمێنەوە من هەوڵم داوە نکۆکی لەهەموو شتێك بکەم وەلێ وێرانکردن چ ئاسان ئاوەدان کردنەوە چەند ئاستەم ئەم گوتە گریمانییە خەمهێنەرو هەفمەند لەگەڵ دڕ دۆنگی و گرێدراو بەتازە لاوی دواتر تەنیا لەڕووی شێوەی دەر بڕینەوە نەگۆڕا ٠ ئەو دڵپەرۆشییە سەرمەستانەو لەهەمووش بنەڕەتی لەدەسپێکی منداڵیش دا هەبوو هەرگیزنەگۆڕا . بەراوردێك لەگەڵ کیەرکە گۆرد لەمبارەوە نیشان دەدا کە جیاوازییەکی رەگازۆکردوتر هەیە کیەرکە گۆرد رۆحی لێوڕێژ لەئیمان بەمەسیحیەت بوو تاکۆتایش بەردەوام سنوردار و پابەند بە کەوشەنی گەوهەری مێژووی مایەوە چونکە دەی گوت باوکم وەهای پێ دەگووتم بەلام گەوهەری مێژوویی مەسیحیەت هەمیشە لەگەڵ نیچە دا بێگانە بوو پاشان کیەرکەگورد لەقولای ئاخاوتەی مەسیحی بالا دەستی پەیدا کرد ئەمە لەکاتێکدا بوو کەنیچە پێی وانەبوو کە ئاخاوتەی مەسیحی دەلوێ قوول بێ و هیچکات سەر قالی پێکهاتە شکۆدارەکانی لەجیهانی هزردا نەبوو . ئەوەی تائێرە گوتمان پوختەیەك لەبناخەی شرۆڤەی ڕەخنەکارانەی باسی داهاتووی ئێمەبوو. یەکەم دەبینین کە بەربەرەکانی نیچە لەگەڵ مەسیحیەت چۆن لەسەر کۆڵەکەی مسیحیەت ئە نجام دراو ئەو تا چ ڕادەیەك لەم کەتوارە ئاگادار بوو .دەبینین کە سەمەدی مەسیحی لەودا چۆن لەسەرەتاوە لەنێوەڕۆکی مەسیحی بەتاڵ بونەوەو شێوەی وزەی پاڵنەری پەتییان بەخۆوە وەر گرت .پاشان باس لەوەدەکەین کە نیچە چۆن بە ئاراستەی پێچەوانەی تێکڕای هەڵوێستەکانی و تاقیکارییەکانی خۆی بە نیهیلیزم یا پوچ گریمانکاری گەیشت و چۆن هێنابیە دی و چ جۆرێ ئەو ڕێچکە نیهلیستیەی وەکو ڕێگە یەکی

پەرێز هەڵنەگرو حاشا هەڵنەگری چاخی ئێمە گەرچی بۆ جەماوەری هێشتا لەدۆخی کۆمۆن خوازراویانە خوازراو تا دواین لێکەوتەکانی بڕی هەڵبەت دەبێ سەرنج لەوە بدەین کە ئەو بۆ پوچەڵکردنەوەی نیهیلیزم لەشوێن دەسپێك و چاوگە یەکی تەواو تازەوە دەستی بەم کارە کرد نەك بۆئەوەی نیهیلیست بمێنێتەوە سەرنجام

لەڕووبەڕوو بونەوەی لەتەك ئەم فەلسەفە نوێیە بە سێ پرسیار دەگەین .ئایا ئەم فەلسەفەیە هێشتا پێوەندێکی لەتەك ڕیشە مەسیحیەکانیەوە هەیە ؟ئایا لەڕاستی دا هەیە ؟ سروشت و ئاراستەکەی چی یە؟بەر لەسەر قڵبوون بەم پرسیارانەوە دەبێ بیرو بۆ چوونەکانی نیچە لەمەڕ دیاری مەندی و مێژووی خودی مەسیحیەت بێنینە بەر چاومان لەسەرەتاوە گووتە پێکناکۆکەکانی ئەو پشت گوێ دەخەین تابتوانین هێڵە سەرەکییەکانی وێنەیەکی بێ خەوش کەبە تاییەتی لەدواین نوسینە کانی ئەو دێتە دەست بکێشینەوە تائەم وێنەییە لەگەڵ هەموو توندو تیژی لەسازان نەهاتووی وەدەست نەیێ ناتوانین ببینین کە هروژمی ئەو تا چ ئاستێك دەبێ لەدەقێکی قووڵتردا تۆمار بکرێ دەقێك کەلەو دا دەبینرێ هێرشی نیچە شتێك نەبووە جگە لەدیاردەییەکی ڕووکەش و ئەو نەیتوانیوە ئەوە بەلێبڕاو بنەتایی و بێ ئەملا و ئەولا بزانێ.

---

١ -کتێبی نیچە و مەسیحیەت لاپەرە ٦٨

٢- دواهەمین کوفرەکانی نیچە (فەردین دارا ) وەرگێرانی کوردی

٣ -ئینجیل پێنجەم (بیچە ) عەرەبی

٤ -ئاین چیە (عادل باخەوان) کوردی

# فیلەسوف جۆرج بەرنادشۆ: دەڵێت ئەم کتێبە قەدەغە بکەن

نوسەرو ئەدیب (جۆرج بەرناد شۆ) لەبارەی (کتێبی پیرۆز) ە وە ئە ڵێت : ( لەخەتەر ترین کتێبەکانی سەر زەوییە لە دۆلاّ بێك دا بیهێنەوە و بەکلیل دایخەن ) کتێبی پیرۆز دابنێن لە جێیەکی دوور لەمنداڵەکانتان کە دەستیان نەی گاتێ بەلاّم کێ گوێ لە ئامۆژگارییەکەی ئەگرێ ؟ بە پشت بەستن بەو یاسا ڕوشتیانەی کە حکومەتی خوارو ئەفەریقاحکومی پێ ئەکات هەستان بە قەدەغە کردنی شانۆیی (خۆشەویستەکەی خاتو چاڕلی ) لەبەر بوونی تەنها یەك ووشەی بێ شەرمانە تیایدا لەوانە بوو کتێبی پیرۆز یشیان قەدەغە بکردایە ئەگەر کتێبێکی ئیسلامی یان هیندی بووایە بەلاّم ئەوان لاوازن کاتێك ڕووبەڕووی (کتێبی پیرۆز) ئەبنەوە چونکە ئەوە (هۆکاری ڕزگار بونیانە کە پشتی پێ ئەبەستن ) وەکو خۆیان باوەڕیان بەوەییە .خوێندنەوەی چیرۆکەکانی ناو کتێبی پیرۆز بۆ منداڵاَن دەرگا ئەخاتە سەرپشت بۆگفتو گۆکردن لەبارەی ئاما نجی ئە نجام دانی سێکس وەکتێبی پیرۆز ئەگەر شەرمی لێ نەکرێ و لێی نەترسن لەوانەیە ئە نجومەنەکانی چاو دێری وای دابنێێن کەتەنها بۆ گەورەکان شیاوە ئەوانەی کەوا هەژدە ساڵیان تەواو کردووە (الحقیقە المجردە ئۆکتۆ بەر ١٩٧٧ )

# نیچەو مەسیحیەت

خوێندنەوەی نیچە ئاسان خۆدەنوێنیٚ ئەوبینینەئاساییەکانی خۆی و درۆگەلیٚ کە ئاشکرای کردون و هروژمە تو ڕە یی و وروژێنەکانی بۆ سەر هەر شتانێك مرۆڤان رێزیان لێدەگرن و پێشبینیەکانی خۆی لەبارەی چارەنوسی شوم و مەرگبار کە نیهلیزمی ئەمڕۆیی زێدە بارییەتی و جادوی توند ئا ژ ۆ یی لە ئا خاوتە و دیدو بۆ چونە سە رترەکانی خۆی ساف و بی پێچ و پەنا هەنگاو ریز بەندی دەکا.مر ۆڤ دۆستانی بڕوا دار بە پەیام وهیرا ی چاخی رۆشنگەری بەدرۆ ئەویان بە یەکێك لە خۆیان ناساندوەو قووڵاییان لەو ساندۆتە وە .نازییە کان کە بەریانی فیکری ئەو هیچ خاڵێکی هاوبەشی لەگەڵ ئەواندا نەبوو بەشێکی هە رە زۆری وشە کانی خۆیانیان لەو وەرگرت هەروە ها لەو وەکو گەو رەترین سە رچاوەی زمان و دەربڕینی نائومێدی ئەمڕ ۆیی و پێچ وپەنای گفتو گۆ گەلی نابەجیٚ و بەدەر لە بەرپرسیاریەتیی بەناو ڕوناکبیرانە کەڵك وەرگیراوە .بێگومان نوسینە کانی ئەو لە خشتە بەرو کەڵکەڵەور ژێنە.بەڵام هەموو ئەمانە واتای دروستیان پێشێل کردوە.ئەوەی دەلۆی بیٚ بەزەییانەترین هێرش بۆ مەسیحیەت لە چاخی ئێمەدا لەقەڵەم بدریٚ بەدەستی ئەم پیاوە ئە نجام درا لەگەڵ ئەوەشدا لەم پەلامارەدا کەتوارێکی سەر سو ڕهێنەر سەرنجمان رادەکێشیٚ و ئەوەش ئەمەیە کە نیچە کوڕیقەشەیەك لەسەر بنەمای وزەگەلی بزوێنەری ڕاستە ڤینەی خۆی.. واتە شێلگیرو راست بێژیو ڕێگەو مێتۆدی لە

بنچینەو لەسازان نە هاتوی خۆی ئاگاداربوو ودانیی پێ دەنا ئاما نجی ئەم کتێبە نیشاندانی ئەم کەتوارە و هێنانەوەی شایەتی و بەڵگەو دیکۆمێنتەکانی مەسیحیەت میژووە نەك میژوویەکی بەهیچ شێوەیەك دەست لێ نەدراوو. یەکدەست و یەکسان بەڵکو توشی دووبەرەکی لە دژی خۆی کە بەردەوام لەرێگەی سەرەکی لادەدا بووە بەلاّم سەرنجام هەمد یس دێتە سەر رێی ڕاست مەسیحیەت میژووی رۆحی ڕۆژئاوایی ئێمە یە هیچ کەس ناتوانێ پێناسەی بکات هەژانە قورسەکان کەلە کتێبی پیرۆز هەم چاخی کۆن و هەم چاخی نوێ ەوە دێن تەنانەت لەجێیەکەوە کە هیچ مرۆڤێك لە چاوگەو بنەچەیان ئاگادار نیە هەم دیس باند ۆری خۆیان دادەنێن .من دەمەوێ نیشان بدەم کە ئەم نیچەی دژە مەسیح دەجالّ چەندە مەسیحیە مەبەستی من بانگهێشتە بەقوولّ تێهزرین لەبارەی هێرشەکانی ئەو نەك کول کردنی نووکی تیژی رمی هێرشەکانی ئەو نەك کولکردن نووکیتیژی رمی هیرشەکە تەنیا خوێنە رێکی هەڵەشەو ڕواڵەتبێن کەتوندڕەوی دەم هەراشانەی نیچە کوێری کردووە دەلووێ تەنیا سەرکێشی و دوژمنی لەتەك هەر شتێکی مەسیحی لەودا ببینێ تێفکرینی ڕوحانیەتی مەسیحی لەهەرجل و بەرگێك دا کە خۆی گۆڕی بێ ملی بۆ هەر سازانێك راکێشانی بێ هەمد یس خودی عیسا بەردەوام هەمان هۆکاری شۆڕش گێڕانە ماوەتەوە کە توێژەکانی رۆژگاری بەبەردەوامی قلیشاندوەو هەڵقولاّوەو سەر ڕێژبووە عیسا تەنانەت ریگەی هروژمی نیچەش دادەخا راستە کە وێنەی نیچە لەعیسا قەناعەت بە ئێمە ناکاو ئەو تەنیا یەکیك لەئاقارەکانی عیسا بۆ ئێمە دەنوێنێ نەك خۆی لەگەڵ هەموو دڵ فراوانی و دەست بلاّوی و مەزنایەتی نیچە لەبەرامبەر خۆ ڕاگری و تۆکمەیی نێواخنی پیاویك کە هیچ شتێك دوو دڵی نەدەکردو نەی دەهەژاندو لەبەر ڕاستی و ڕاستگۆیی عیسا سەری کڕنوش دادەنەوێنێ نیچە یەکێك لەبناغە دانەرانی هزری ئەمڕۆییە کەهەموو شتێك

بەوەوە گومانایکراوتر لە هەمیشە دەردەکەویو ئاشکرا دەبێ.نیچە دەگاتە کۆلانێکی بەربەست کە مرۆڤ لەودا ئامانجی بزر کردەوە ئاراستە دۆ ڕاو دێتە بەر چاو کەلەێ پیاو و دوپاتبوونەوەی هەرمانی و ویستی ئاراستە کراو بۆ هێز هەموویان بریتین لە بنەواشە گەلی باوەڕدارانەی نوێ لەدوایین دە ورەی ژیانی نیچە دا بەلام ئەو بنەواشانەی کە هەنوکە ئاشکرا کراون هەرلەسەرەتاوە پێکهاتە گەلی زۆرکارانەو بێهودە بوونە لەگەلێ ئەوەش دا بەرهەم گەلی پڕ ئەژمارو بەینی نیچە لەکۆی خۆیاندا ئەمرۆ کە بوونەتە ئامرازێك بۆ فێرکردنی هەقیقەت بە ئێمە کارو هزری نیچە تاڕادەیەکی زۆر هەموو ئاریشەکانی ڕۆژگاری ئێمە وە پشت سەر دەنێ ئاریشەگەلێ کە بەتێپەڕینی هەر دەیەك پەلەترو هەرە پێویست ترو توندو تیژترو لە چارەنە هاتوتر بووە نیچە یەکەمین کەس بوو کەلەم ئارایشتانە هێندە هەژا کەوا دێتە بەر چاو کە ژیانی بۆتە گیانفیدای چاخی ئێمە.

---

١ -کتێبی نیچە و مەسیحیەت لا( ٧٢ )

٢ -دواهەمین کوفرەکانی نیچە ( فەردین دارا ) وەرگێرانی کوردی

٣ -ئینجیل پێنجەم (بیچە ) عەرەبی

٤ -ئاین چیە ( عادل باخەوان ) کوردی

# ئەو پێشبینیەی هاتۆتە دی ؟

**مەتا و لوقا بە گرتینیکە وە ئەیانەوێت قەناعەتمان پێ بکەن بەوەی کەوا پاداوو دبنەچە (سلف) ی ڕەسەنی عیسایە ئەویش بەهۆی بۆ چونە هەڵە کەیانەوەیە کە گوایە عیسا (لەسەر عەرشەکەی دادەنیشێ) بەڵام مزگێنیەکان دژە یەکن لەگەڵ ئەم پێشبینیە دا چونکە پێمان ئەڵێن کەلەجیاتی ئەوە عیسا لەسەر عەرشەکەی (داوود) ی باوکی دابنیشتایە (بیالاگیس)ی بتپەرستی ڕۆمانی لەسەر هەمان ئەو عەرشە دانیشتبوو . وە هەر ئەویش میراتگیری ڕاستەقینەی عەرشی (عیسای) ئیدا نەکردو حکومی مردنی بۆ دەرکرد بەڵام مەسیحی پێت دەڵێن : ( قەیناکە ئەگەر ئەم پێشبینیە لە هاتنی یەکەمی دا جێبەجێ نەکرابێ ئەوا لەگەڕانەوەی دووەمی دا جێبەجێ دەکرێ سێ سەد پێشبینی تریش یەتەدی ) بەڵام دوو دانەرەکە لەبەر گەرمووگوڕیان بۆکارەکە هەر لەیەکەم هەنگاوی تۆمار کردنی ڕەچەڵەکی عیسا وە ئەکەونە هەڵەوە چونکە کتێبی ﴿أعمال الرسل﴾ئەڵێت کە عیسا ﴿ لەنەوەی پشتی خۆیەتی ﴾ (أعمال الرسل ٢:٣٠) واتە کوڕی خۆیەتی مەتتا لە (١:٦) ئەڵێت : کە عیسا کوڕی داوده و بەسلێماندا تێپەڕیوە . بەڵام لەلۆقادا (٣:٣١) ئەڵێت : کەعیسا کوڕی داوده بە ﴿ناتان﴾ دا تێ پەڕیوە مەسەلەکە پێویست بەوە ناکات کە لە زانستی ڕەچەڵەك ناسیدا زانایەکی پسپۆڕ بهێنین تا پێمان بڵێت ناکرێ لەهەمان کاتدا تۆی داود لە ڕێی سولێمان و ناتانەوە گەیشتبی بە دایکی**

**عیسا ئێمە ئەزانین کە هەردوو دانەرەکە درۆزنن چونکە عیسا بەبێ هیچ دەست تێوەردانێکی مرۆڤانە هاتۆتە ژیانەوە تەنانەت ئەگەر ڕازیش بین بەوەی کە داوود بقچەی عیسایە ئەوا ئە نجامەکەی هەر هەمان شت دەبێت لەبەر هەمان هۆ .**

## نوسەرە ڕاستەقینەکانی کێن ؟

**لەبەر ئەوەی لێرەدا چەندەها نموونەی تر لە (صموئیل) و سفر (الايام الاول) دێنمەوە ئامۆژگاریت دەکەم کە لەبری ئەوەی گومان بکەن لەوەی کە خودا دانەری ئەو کتێبە دژ بەیەکانەیە بە وردی سەرنج بدەنە. گەڕان بەدوای نووسەری ڕاستە قینەی ئەم کتێبانە ئەو زانایانەی کە بەسەر دەقە پوختە کراوەکاندا چونەتەوە دەڵێن : أ- (صموئيل٣) : نوسەرەکەی نادیارە .**

**ب- (سفر اخبا الايام الاول) نوسەرەکەی نادیارە لەوانە شەعەزرا کۆی کردبێتەوە و بەسەری دا چوبێتەوە لێرەدا پێویستە هەڵوێستێك بکەین و سەرسوڕمانی خۆمان دەربڕین بەرامبەر ڕاشکاوێتی زانایانی پیرۆز بەلاَم پاشکۆکانیان هەمیشە ووشەکانی (ئەشێت) و ( لەوانەیە) و (ڕێی تێدەچێ) والێك دەدەنەوە کە ڕاستیەکی سەلمێنرا و حاشا هەڵنەگرن ئاخۆ بۆچی عەزرا و ئەشمیای داماو بکەینە قوربانی لەجیاتی کۆمەڵێ نوسەری نەناسراو ؟**

# هەوڵێك بۆ خۆ ڕزگار کردن لە بێلایەنی

**سەرڕەای سانایی ئەو لۆژیك (منتق) ەی پێشەوە بەلاّم هێشتا ناچیٚ بە مێشکی مەسیحی تەرەفی گردا. با نموونەیەکی هاوشێوەی بێنین کە مێشکە تەرەفگیرەکەی بتوانیٚ قبوڵی بکات ئێمە لە ڕێگەی مێژووەکەمانەوە دەزانین کەوا پێغەمبەری ئیسلام ﴿محمد(د.خ)﴾ کوڕی ئیبراهیمە و بە ئیسماعیل دا تیٚ پەڕیوە بۆیە هەر نوسەرێك کە بانگەشەی (نیگا بۆ کردن) بکات وە بیەویٚ پێمان بڵیٚ کە ﴿محمد کوڕی ئیبراهیمە و بە ئیسحاقدا تیٚ پەڕیوە﴾ ئەوا وەلاّمی ڕاستەو خۆمان ئەوەیە کە ئەو کەسە درۆزنەو هەڵیبە ستووە چونکە ناگونجیٚ نەوە یان تۆوی ئیبراهیم گەیشتبێتە ئامینە (دایکی محمد)لەڕێی ئیسماعیل و ئیسحاقەوە لەهەمان کاتدا ! جیاوازی نێوان دوو نەوەکەی ئیبراهیم لێرەدا جیاوازی نێوان جولەکە و عەرەبە. لەحاڵەتی﴿محمد (ص)﴾ دا ئێمە هەموو کەسێك بەدرۆ ئەخەینەوە کە بڵیٚ لەنەوەی ئیسحاقە بەلاّم لەحاڵەتی عیسادا (علیە سلام) ئێمە وا دەبینین کە مەتتا و لۆقا هەر دووك جێگای گومانن هەتا ئەو کاتەی کە مەسیحیەکان یەکێك لەنێوان ئەم دوو ڕەچەڵەکە دا هەڵئە بژێرن کە لەگەڵ خواکەیاندا بگونجیٚ ئێمە ناچارین تا ئەو کاتە هەردوو مزگێنیەکە ڕەت بکەینەوە مەسیحیەت دوو هەزار ساڵە هەوڵ ئەدات چارە سەرێك بۆ ئەم کێشە ئاڵۆزە بدۆزێتەوە و تا ئێستا کۆڵی**

**نەداوە.ئێمە سلاّو لەو روحە دان بەخۆدا گرەیان ئەکەین هێشتا بڕوایان وایە کە (کە ڕۆژگار چارەی بۆ ئەدۆزێتەوە).دەنگۆیەکی زۆر هەیە کە گوایا کتێبی پیرۆز وتەی دژ بە یەکی تیّدایە کە تا ئێستا زاناکان نەیان توانیوە چارەییان بۆ بدۆزنەوە وە کۆمەڵێ شتی وەها تیّداکە دڵی کافرو بێباوەڕانی پیّ خۆش دەبیّت کۆمەڵێ ئاستەنگی وەها لەدەقەکاندایە کە تاوەکو ئێستا زاناکان بەر بەرەکی لەگەڵ دەکەن کەسیش ناتوانیّ خۆی لەم ڕاستیە لادا تەنها ئەوانە نەبێت کە نەشارەزان بەکتێبی پیرۆز** (١).

---

**١ -(الحقيقه المجرده ئۆکتۆبەر ١٩٧٧)**

**ئایا کتێبی پیرۆز وتەی خوایە**

**الوجه الاخر للمسيح (فراسالسواح) عەرەب**

# جیاوازی نێوان دوو هەزارو سێ هەزار

(( سفر الملوك الاول )) ( ٣٦:٧ )

**ئەستوریەکەی بستێك بووە لێوارەکەی وەك لێواری جام بووە لەها وشێوەی گوڵی سەوسەن و دوو هەزار حەو زی مەلەی تیا جێ ئەبووەوە** (١)

(( سفر الاخبار الايام السانى )) ( ٥:٤ )

**ئەستوریەکەی بستێك و لێواری وەك لێواری جام بوو لەهاوشێوەی گوڵی سەوسەن و سێ هەزار حەوزی مەلەی وەر ئەگرت و تیا جێ ئە بۆوە** .(٢)

**بێ توانای دانەری نیگا بۆ کرا و بە نەزانی بێ یان بەزانین لەجیا کردنەوەی دوو هەزار و سێ هەزار شتێکە جێی لێ خۆشبوون نیە چونکە وەکو تیشکی خۆر دژ بەیەك وەستانێکی ئاشکرایە . ((وەبەر چوو (معجزە) ش ناتوانێ بیسەلمێنێ ٣+٣=٥ یاخود بازنەی چوار سوچی هەیە وە چەند بەر چووەکان زۆر بن ناتوانن ئەو دژیەکیانە لابەرن کە لە ڕێنمایی و کتێبەکانی مەسیحیەتدا هەیە**

---

١- کاس

٢- البحث عن يسوع اتاريخى

# دژ بەیەك كەڵەكەبووەكان

پێش ئەوەی كۆتـای بێنم بە خستنە ڕووی زنجیرەی دژە یەكەكان دوا نمونە تـان پێشكەش ئەكەم لەنێوان سەدان نمونەی تردا كەكتێبێكی پیرۆزی پڕكردۆتەوە تـاكو جارێكی تـر مولْكەكەی پاشا سولێمان ببینین كە هەموو شتەكان بە قەبارەیەكی گەورەی وا دروست دەكات كە پاشای پێشوی ئێران لەچاویا وەك منداڵ دەردەكەوێ دانەری (سفر الاخبار الايام السانی ٩:٣٥ ) هەزار تەویلەی ئەسپ زیاد ئەكات بۆ حەوزی مەلەكان .(وەسولێمان چوار هەزار جێگای ئاخوڕی ئەسپی هەبوو... ) بەلاّم دانەری ( سفر الملوك الاول ٤:٢٦ ) خەیاڵێكی شاهانەی گەورەتری هەبووە ئەوەتـا ژمارەی تەویلەكان بەرێژەی (١٠٠٪ ) لەسەدا هەزار زیاد كردووە بەجۆرێ كەبوو بە چل هەزار (٤٠٠٠٠ ) لەباتی چوار هەزار (٤٠٠٠ ) تەویلە وە پێش ئەوەی قەشەیەك هەڵتان خەڵەتێنێ و بڵێ كە ئەو سفرە زیادەیە هەڵەیەكەو یەكێ لەنوسەرەكان كردوویەتی ئەبێ ئاگادارتـان بكەمەوە كە یەهود لەسەردەمی سولێماندا هیچ شتێكیان لەبارەی سفرەوە نە زانیوە چونكە عەرەب ئەو سفرەیان فێری خۆرهەلاّتی ناوەڕاست كردووە پاشان ئەوروپییەكان پاش چەند سەدەیەك لەوانەوە فێر بوون بەڵكو یەهود لەدانراوە ئەدەبیەكانیان ژمارەكانیان بە ووشە نوسیوەو ژمارەیان بەكار نەهێناوە .
پرسیارە گەورەكە لێرەدا ئەمەیە : كێ دانەری ئەم دژە یەكە سەرسوڕ هێنەرانەیە

**؟ خودایە یان مرۆڤ ؟ ئەتوانی تەواوی بەڵگەکان ڕاستی زیاتریش بزانیت لەکتێبێکی تێروتەسەل دا بەناوی (کتێبی پیرۆز ووتەی خودایە یان ووشەی مرۆڤ ؟ ) لەنوسینی ﴿ أ.س. ك. جومال﴾** (١)

---

١ -الكلام المقدس كلام الله ام كلام البشر

# جیاوازی نێوان چوار هەزار و چل هەزارو سی و شەش هەزارە

(( سفرالملوك الاول ٩:٣٥ ))
**سولێمان لە چوار هەزار جێگای بەستنەوەی ئەسپی گالیسکەی هەبوو لەگەڵ دوانزە هەزار سواردا لەشوێنی گالیسکەکان لای پاشای ئۆرشەلیم جێگیر کردن .**

## سی و شەش هەزارە

(( سفر الملوك الاول ٣٦:٤ ))
**سولێمان چل هەزار جێگای بەستنەوەی ئەسپی گالیسکەی هەبوو لەگەڵ دوانزە سواردا**

**یەهودیەکان ڕەنوسی سفریان بەکار نەهێناوە لە پەیمانی کۆندا**

## دەرئەنجام

**چۆن ئەتوادڵنیابین لەوەی کەئەو کتێبەی ئەوان ئەڵێن لەخواوەیەوبەڕاستی وتەی خوایە؟چەند تاقیکردنەوەیەك هەیە  کە لەڕێیەوە ئەتوانین لەڕاستێتی ئەم  کتێبە دڵنیا بین یەکێك لەم تاقیکردنەوانە ئەوە یە کە هەر نامەیەك لە کەسێکی خاوەن زانستی تەواو دەبێت  پێویستە متناسق و دامەزراو بێت  لەسەر بنەمایەکی دیاری کراو ناکرێ ڕای دژبەیەك و ناچونیەکی تیا بێت ئەمەش ئەوەیەکە(( دوا پە یمان ))ئەڵێت کەوتەی خوایە (أفلا يتد برون القران ولوكان من عزر غير اللة لو جد وا فية اختلافا كثيرا). (النساء ° /٨٣)**

## قسەی کامیان خوایە یان شەیتان

**ئەگەر خودای گەورە بیەوێت ئەم تاقیکردنەوە قورسە لەسەر  قورئان بکەین ئەی بۆچی هەر کتێبێکی تر کە بانگەشەی ڕەسەنێتی بکات  نەدەینە بەر هەمان تاقیکردنەوە   ئێمە نامانەوێ وەکو مەسیحیەکان  هیچ کەسێك بە دەستەواژەی لێڵ و نامۆ تووشی شڵەژان بکەین  ئێوەش هاوڕێم دەبن لەڕێگەی ئەو بەڵگانەوە کە لە  پێشەوە لە کتێبی مەسیحیەکان خۆیانەوە خستومنەتە ڕوو  کە لەکاتی**

هەوڵدانیاندا بۆ ئەوەی پێمان بسەلمێنن کە کتێبی پیرۆز قسەی خوایە خۆیان ئەوەیان سەلماندوە کەکتێبی پیرۆز قسەی خوا نیە! باشترین نموونەی زیندوش بۆ ئەم نەخۆشیە دوێنێ لە کۆمەڵگای کەنەسی ڕووی دا کاتێ کە گەورەی قەشەکان (بیل بیرنیت) لەبەردەم کۆمەڵێ لەزانایانی لاهوت و قەشەکاندا بە زمانی ئینگلیزی کە زمانی بنە ڕەتی خۆشیانە وتاری دەدا بەلام لەگەلٚ ئەوەشدا نەیان دەزانی ئەم گەورەی قەشانە چی دەڵێت بەجۆرێك کە ململانێی گەورەی بەڕێوەبەری ڕۆژنامەی (THE NATAN MERCRY) لەلێدوانێکی خۆیدا لەسەر ئەو فەوزاییەی کە گەورەی قەشەکان لە وتارەکەیدا خولقاندی وتی تێبینیەکانی گەورەی قەشەکان ڕوون بوون و ئەوەش بووە هۆی بڵاوبوونەوەی هەڵە تێگەیشتن و فەوزا لە نێوان ژمارەیەکی زۆری دانیشتوان دا .زمانی ئینگلیزی خۆی لەخۆیدا هیچ کەم و کوڕیەکی تێدانیە بەلام نابینین کە مەسیحیەکان ڕاهێنراون لەسەر بیر کردنەوەی شێواو لەسەر جەم کارو بارە دینیەکاندا ئەو وتانەی لەخوانە . خواییەکەدا پێشکەش کران: نەبوو بەڵکو گۆشت بوو؟ بادەکەش خوێن بوو؟ سێ یەکەش یەکێ بوو هەر ئەو بوو کەمرۆڤی دروست کرد بەلام ئاسمانی بوو بەلام خراپ تێ مەگەن چونکە مەسیحی لە مامەڵە کردنی دونیای دا هەر وا ساویلکە نیە بەڵکو زۆر ووردە لەم حاڵەتانەدا لەبەر ئەوە پێویستە زۆر ووریا بین لەکاتی ئەنجامدانی گرێ بەست لەگەڵیاندا چونکە لەوانەیە شتەکەت پێ بفرۆشن بەرلەوەی هەست بکەی چی ڕۆی داوە. لەم بوارەشدا بەڵگە گەلێکم لایە ئەو دژایەتیانەی بەناو کتێبی پیرۆز دەسەلمێنن کە لە پێشەوە ئاماژەم پێدان لێرە بەدواش ئەو نمونانە دەخەمە ڕوو تەنانەت منداڵێکیش بەئاسانی تێیان دەگات بۆیە تێبینی ئەوە دەکەن کە هەردوو نوسرانی کتێبی (سفر اخبار الايام الاول) و (صموئيل٣) هەمان چیرۆکی داودمان پێ ڕادەگەیەنن کە هەستاوە بەقڕ کردنی

**نەوەی ئیسڕائیل کەواتە بیرۆکەی قڕکردنی بەنی ئیسڕائیل لەکوێوە هات ؟ نووسەری ( صموئیل٣ ) ( ١:٣٤ ) پێمان ڕادەگەیەنێت ئەوە خێرا بووە کە داودی هەڵناوە لەکاتێك دا دانەری ( سفر الاخبار الايام الاول ) ( ١:٣١ ) پێمان ئەڵێت کە : شەیتان هانی داوە بۆ ئەو کارە ناشرین و چەپەڵە ! باشە چۆن دەبێت کە خودا سەرچاوەی ئەو دوو ڕستە دژە یەکە بێت ؟هاندەرەکە خودایە یان شەیتانە ؟ ئاینێك هەیە کەتیایدا ووشەی خوداو شەیتان یەك مانایان هەیە؟ من لێرەدا باس لە ( شەیتان پەرستان ) ناکەم کەلویەکی پیسە و لەناو مەسیحیەتدا گەشە ئەکات چونکە ئەبینین کۆمەڵێك مەسیحی وازیان لە مەسیحیەت هێناوە و دەستیان داوەتە پەرستنی شەیتان.**(١)

---

**١ - ئایا کتێبی پیرۆز وتەی خوایە**

**٢ - بە پێی ئینجیل و تەورات ( محمد د.خ ) پێغەمبەری خودایە ( د.ئەحمد دیدات**

**٣- الوجه الاخر للمسيح ( فراسالسواح ) عەرەبی**

## کام یاکو خاوێنی

تاوەکو بۆت دەرکەوێ کەدانەری ( سفرالملوك الاول )دوو هەزار ( ٢٠٠٠ ) جێی دەست بە ئاو گەیاندن (ئاودەست) ی لەکۆشکی سلێماندا ژماردووە (٣٦:٧ )بەلاٌم دانەری ( سفر الملوك الايام دووەم )لە ( ٥:٤ ) ئەم ژمارەیەی بەرێژەی ( ٥٠٪ ) زیاد کردووە و ئاودەستەکانی گەیاندۆتە (٣٠٠٠ ) سێ هەزار ئەم هەموو هەڵە و زیادەڕەوییە چیە لە کتێبی خوادا !ئایا

## هەندێك لە دژیەکەکانی ئینجیل و تەورات

**سفر التكوين الإصحاح ١ : ٣-٥ خلق النور والليل والنهار في اليوم الأول**
**تناقض سفر التكوين الإصحاح ١ : ١٤ خلق النور في اليوم الرابع**

**-سفر التكوين الإصحاح ١ : ١٤-١٩ القمر يضيء**
**تناقض سفر أيوب الإصحاح ٢٥ : ٥ القمر لا يضيء**

**-سفر التكوين الإصحاح ١ : ١٧ رأى الله أن السموات حسنة**
**تناقض سفر أيوب الإصحاح ١٥ : ١٥ السموات غير طاهرة بعيني الله**

**وتناقض سفر أيوب الإصحاح ٢٥ : ٥ الكواكب غير نقية في عيني الله**

**-سفر التكوين الإصحاح ٢ : ٣ تعب الرب فاستراح في اليوم السابع**
**تناقض سفر اشعياء الإصحاح ٤٠ : ٢٨ الرب لا يكل ولا يعيا**

**-سفر التكوين الإصحاح ٣ : ٩ نادى الرب آدم وقال له أين أنت**
**تناقض سفر الأمثال الإصحاح ١٥ : ٣ " في كل مكان عينا الرب مراقبتين "**

**-سفر التكوين الإصحاح ٥ : ٢٣-٢٤ سار أخنوخ مع الله ولم يوجد لأن الله أخذه**
**وأيضاً سفر الملوك٢ الإصحاح ٢ : ١-١١ إيليا يصعد إلى السماء**
**تناقضا إنجيل يوحنا الإصحاح ٣ : ١٣ لم يصعد أحد إلا ابن الإنسان**

**سفر التكوين الإصحاح ٦ : ٣ يكون عمر الإنسان ١٢٠ سنة**
**تناقض سفر التكوين الإصحاح ٩ : ٢٩ عاش نوح ٩٥٠ سنة**
**وتناقض سفر التكوين الإصحاح ١١ : ١٠-٢٦ أعمارهم بمئات السنين**

**-سفر التكوين الإصحاح ٦ : ٦-٧ ندم الله أن خلق الإنسان وقرر أن يمحوه عن وجه الأرض**
**وسفر الخروج الإصحاح ٣٢ : ١٤ فندم الرب**
**وسفر صموئيل١ الإصحاح ١٥ : ٣٥ والرب ندم**
**تناقض سفر العدد الإصحاح ٢٣ : ١٩ ليس الله إنساناً فيكذب ولا ابن إنسان فيندم**

**-سفر التكوين الإصحاح ٦ : ١٩-٢٠ ذكر وأنثى من كل جنس دخلوا السفينة**
**وسفر التكوين الإصحاح ٧ : ٨-٩ ذكر وأنثى من كل جنس دخلوا السفينة**

**تناقضا سفر التكوين الإصحاح ٧ : ٢-٣ من الطاهرة سبعة ذكر وسبعة أنثى ومن غير الطاهرة ذكر وأنثى**

**-سفر التكوين الإصحاح ٨ : ٤ استقر الفلك في الشهر السابع على جبال أراراط**
**تناقض سفر التكوين الإصحاح ٨ : ٥ في أول العاشر ظهرت رءوس الجبال**

**-سفر التكوين الإصحاح ١٠ : ٢٤ أرفكشاد ولد شالح وشالح ولد عابر**
**وسفر التكوين الإصحاح ١١ : ١٢-١٤ أرفكشاد ولد شالح وشالح ولد عابر**
**وأخبار الأيام الأول الإصحاح ١ : ١٨ أرفكشاد ولد شالح وشالح ولد عابر**
**تناقض إنجيل لوقا الإصحاح ٣ : ٣٦ عابر بن شالح بن قينان بن أرفكشاد**

**-سفر التكوين الإصحاح ١١ : ٥ نزل الرب لينظر المدينة والبرج**
**تناقض أخبار الأيام الثاني الإصحاح ١٦ : ٩ لأن عيني الرب تجولان في كل الأرض**

**-سفر التكوين الإصحاح ١٤ : ١٢ لوط عليه السلام ابن أخ إبراهيم**
**تناقض سفر التكوين الإصحاح ١٤ : ١٤ لوط عليه السلام أخ إبراهيم**

**-سفر التكوين الإصحاح ١٥ : ١٣ نسل أبرام سيكون غريباً في أرض ليست لهم ويُستعبدون لهم ٤٠٠ سنة**
**تناقض سفر الخروج الإصحاح ١٢ : ٤٠ أقاموا في مصر ٤٣٠ سنة**

**-سفر التكوين الإصحاح ١٧ : ٨ وعد الله أرض كنعان ملكاً أبدياً لأبرام ونسله**
**وسفر التكوين الإصحاح ١٣ : ١٥ وعد الله أرض كنعان ملكاً أبدياً لأبرام ونسله**

لەفزییەشی دەوترێ،کە سەدو چوار کتێبن و بۆ پێغەمبەرەکانی ناردووە( د.خ )وەك تەوراتی حەزرەتی موسا و زەبووری حەزرەتی داوودو ئینجیلی حەزرەتی عیسا و قورئانی حەزرەتی ( محمدالمصطفی ) ( صلی الله علیه وسلم ) ئەمە کەلامە لەفزییەش پەیوەندی غەیری خوای گەورەی پێوە نییە،واتە:نە فریشتەکان نە پەری نە ئادەمیزاد،هیچکامیان دەخلیان بەسەر ئەو لەفزانەوە نەبووە،بەڵکو لەلایەن زاتی خواوە بە ڕەقەم لە( لوح لمحفوظ)دا نووسراون و،بە لەفز بە حەزرەتی جیبرەئیل گەیێنراون بەشێوەی ئیلقای قودسی،ئەویش بێ دەس بۆ بردن و زیاد و کەمکردنی هێناویەتیە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەرەکان( د.خ ).ئێستە ئەم قورئانە کە ئێمە دەیخوێنینەوە هەمووی کەلامی خوایەو، بە هیچ جۆرێك یەك ڕستەو یەك وشەی غەیری خوای گەورەی تێدا نییە.بەڵگە لەسەر بوونی سیفەتی کەلام ئەوەیە:دژی کەلام،کە لاڵی و بێ بەیانییە،خەوشەو کەموکوڕییەو،بۆ پایەی خواوەند ناشێ.پێویستە بزانن کە حەقیقەتی سیفەتەکانی خوا،هەروەك حەقیقەتی زاتی،لە تێگەیشتن و ژیری ئێمەوە دوورەو، پەی پێ نابەین،بەڵام بەهۆی نیشانەکانەوە دەزانین کە ئەم جیهانە،بەرز و نزمی،خوایەك و پەروەردگارێکی هەیە( واجب الوجود )ەو،هەرچی سیفەتی تەواوەتییە هەیەتی و،هەرچی کەموکوڕی و خەوشە لێیەوە دوورە..بەڵگە لەسەر حەوت سیفەتەکانی مەعانی،بێجگە لە ئایەتی قورئان و فەرموودەی حەزرەتی پێغەمبەر ئەوەیە ئەگەر یەزدانی مەزن ئەم سیفەتانەی نەبێ دەبێ دژی ئەمانەی هەبێ،وەك مردن،نەزانی،بێ خواستی،بێ هێزی،کەڕی،کوێری،لاڵی،ئەمانەش سیفەتی خەوش و کەموکوڕین و بۆ زاتی یەزدانی گەورە ناشێن.تەنانەت مرۆڤێکی ئاسایی ئەگەر یەکێ لەو خەوشانەی بدرێتە پاڵ زویر دەبێ و ناڕازییەتی پیشان دەدا،ئیتر چۆن نیسبەت لە خوا دەدرێن (( سبحان الله عما یصفون ))..لە لایەکی ترەوە ئەم بارەگا جوانە

ڕازاوەیەی جیهان ئا بەم جۆرە نایابە ڕازاوەیە،کە پیاهەڵدان و تاریف کردنی مرۆڤی هەرە زانابە چەمکێکی کەمیشیدا ناگات،هەموو بە ئاشکرا بەڵگەن لەسەر بوونی یەزدانیێکی(واجب الوجود).زانایانی بیروباوەڕ حەوت سیفەتی تریان بۆ یەزدان بڕیار داوە،کە پێیان دەڵێن سیفاتی مەعنەوییەو،بە هۆی خاوەنیەتی ئەو حەوت سیفەتە مەعانییانەی کە باسمان کردن،نیسبەت دەدرێن لە زاتی خوا،واتە بوونی ئەم صیفەتە مەعنەوییانە لە بوونی سیفەتە مەعانییەکانەوە پەیدا دەبێ،دیارە کە خوای گەورە زیندوویی و زانایی و خواست و توانا و بیستن و بینین و کەلامی بۆ سابت بوو،بوونی خوا بە زیندوو زانا و خاوەن خواست و توانا و شنەوا و بیناو خاوەن کەلام گومانی تێدا نابێ..دیارە ئەگەر زاتێ زانایی نەبێ بوون بە زاناشی بۆ نابێ،ئەم صیفەتانە کە بە عەرەبی((کونه عليما..کونه مريدا...هتد))دەردەبڕدرێن چەند سیفەتێکی ئیعتیبارن و لە حەقایق نین.ئەو سیفەتانەش کە مەحاڵن و بۆ خوای گەورە ناشێن دژی ئەو سیفەتانەیە کە باسمان کردن،وەکو (حدوث) و ( فنا)و،لە حەوادیس چوون و، پێویستی بە غەیرو،لەیەك زیاتر بوون و،مردن و نەزانایی و ناچاری و ناتەوانایی و کەڕی و کوێری و لاڵی..بەتایبەتی لە حەوادیس چوون دەبێتە سەرچاوەی هەموو کەموکوڕی و خەوشێك،بۆ نموونە ئەگەر هاووێنەی ئەجسام بێ دەبێ لە ئەندامەکانی پێك بێ،کە تێکەڵ بوو لە ئەندامەکان هەمووەکەی پێویستی بە یەکە یەکەی ئەندامەکان دەبێ،ئەمەش کەموکوڕی و خەوشە و شایانی پایەی یەزدانی نییە و،سیفەتی ئەو شتانەیە کە لە حەوادیسن..خۆ ئەگەر هاووێنەی جەوهەر بێ،یانی تاقە ماددەیەك کە تاکە و تێکەڵ نییە،ئەوا دەبێ کەڵکی ئەوەی پێوە بێ کە ببێتە پارچەیەك لە جیسم و ڕام بێ بۆ تەرکیبی جیسمی،سیفەتی وەهاش بۆ (واجب الوجود)ناشێ..هەروەها ئەگەر هاووێنەی عەرەز بێ ئەوا وەك عەرەز ئەویش موحتاجی غەیر دەبێ و،ئەم

موحتاجییە لەگەڵ (واجب الوجود)یدا ناگونجێت...دیارە ئەگەر هاووێنەی مەوجووداتی مومکینە بێ،لەوانەی کە خاوەن جیهەتن،واتە:لە خوار و لە ژوور،یا لای ڕاست و چەپی شتێکەوەن،ئەوە مەعنای ئەوەیە خوا بوونێکی سنووردارو خاوەنی مەسافەیەکی تایبەتی و پانی و درێژییەکی دیاری بێ و،بکەوێتە لای ڕاست و چەپ و خوار و ژووری شتەکانی ترەوە!ئەمەیش هەر کەموکوڕییە و بۆ زاتی خوا ناشێ،کە دەبێ لە مادە و سنوور پێویستیی بە غەیر دووری بێ.هەروەها یەزدان لە ئیش و کاریشدا هاووێنەی حەوادیس نییە،چونکەخاوەن کردەوەی ژێر هەر کارێ کە دەیکات لەبەر مەبەستێکە واتە:موحتاجی مەبەستەکەیەو،بۆ بەجێهێنانی ئەو مەبەستە ئیشەکە دەکا،بەلام یەزدانی پاك و بێگەرد هەر شتێکی مەبەست بێت بە (کن فیکون)ێك دەیکاو،ئەگەر لەسەر پلەی ئەسبابیش بیکا ئەوە هەر لەسەر یاسای ڕەفتاری خۆیەتی لە جیهانداو،لەبەرئەوە نییە کە موحتاجی سەبەبەکە بێ و،بەبێ ئەو نەتوانێ بیکا!..هەرگیز پێویستی بەو شتانە نییە کە ئەسبابی عادەتین..هەروەها پێویستە ئێمە باوەڕمان وابێ کە هەموو کردارێکی یەزدان حیکمەت و نرخێکی ڕاستی و تایبەتی هەیە،با ئێمەش پێی نەزانین.((وله الحكمة البالغة في اتخاذ المقصود والمرام،فعال لما يريد من الاغراض والجواهر والاجسام)).ئەی برادەران!زۆر زۆر پێویستە لە کاتی تەمێ و تەربیەی(عوام الناس)دا کە بە ئەندازەی ژیری ئەوان قسەیان لەگەڵدا بکەن،بە تایبەتی لە مەسەلەکانی بیر و باوەڕدا.. پێویستە شتێکیان بۆ باس بکەن کە باش تێی بگەن و لێی حاڵی بن و،ئەوەیان پیشان بدەن کە یەزدانی گەورە زاتێکە (واجب الوجود) بوونی پێویستە،بێ چەند و چوونە،((سبحان من لا يعرف قدره غيره،ولا يبلغ الواصفون وصفه،وكل ما خگر ببالك فربنا على خلاف ژلك)).هەروەها دژی سیفەتی ((القيام بذاته)) ئەوەیە کە بە زاتی خۆیەوە

ڕانەوەستابێ،واتە:وەکو سیفەتێك بێ کە پێویستی بە خاوەن هەبێ و،بە شوێنەوە ڕاوەستابێ و،پێویستی بە (مخصص)بێ،ئەمەش وەك وتمان،مەحاڵە.دژی سیفەتی وەحدەت ئەوەیە کە لە زاتی خۆیدا تێکەڵ بێ،یاخود لە زاتدا یا لە صیفاتدا یا لە کرداردا هاووێنە بێ،واتە:لە کردار و دروست کردندا بکەرێکی تر هەبێ وبەیەکەوە ئیش بکەن،ئەمەش مەحاڵە..دژی ئیرادە و قودرەتیش ئەوەیە کە بوونی یەکێك لە شتە مومکینەکان پەیوەندی بە خواوە نەبێ،واتە:خوا لێی بێ ئاگابێ،یا خواست و ئیختیاری تێدا نەبێ،یا دژی خواست و نیازی ئەو شتێك بێتە وجوودەوە،هەموو ئەم حاڵانە مەحاڵن و لە یەزدانی پاك و بێگەردەوە دوورن.دژی زانین نـەزانینە،دیارە نەزانینی تۆزقاڵێك لەم کائیناتە کەمییە و خەوشە و،پێویستە خوای لێوە دوور بێ..شایانی باسە پێویستە باوەڕمان وابێ کە زانینی خوا هەموو شتێك دەگرێتەوەو،هەروەکو زاتی خوا ئەبەدییە و دوایی نایەت،زانینەکەشی بەو جۆرە نەبڕاوەیەو،هەرچی دێتە دایەرەی وجوودەوە بە سوورەتی زیهنی و عەینی دەبێ لای خوا زانراو بێ و،هەرچی نەیەتە دائیرەی وجوودەوە بەڵام لەوانەبێ ببێ وەك ئەو مومکیناتانەی کە نین،یا هەر قابیل نەبێ بێتە دائیرەی وجوودەوە وەکو شتە موستەحیلەکان،ئەوە پێویستە سوورەتێکی عیلمیی ئەمانە لای خوای گەورە ببێ و لە بازنەی زانینی ئەو دەرنەچن..هەروەها هەرچی زەڕڕە و تۆزقاڵی ئاسمان و عەرش و کورسی و ئەستێرەکان هەیە،لەگەڵ ئەحواڵی مردووەکاندا، پاش مردن و هەتا ڕۆژی قیامەت و،ئەحواڵی ئەهلی قیامەت لە زیندووکردنەوەوە هەتا هەتایەو،زەڕڕاتی مەوجوود لە دۆزەخدا و لە بەهەشتدا دەبێ ئەمانە هەموو لە ئەزەلەوە تا ئەبەد لە بازنەی زانینی خوادا حازر بن و،خوای گەورە پیچپیان بزانێ.ئەو سیفەتانەش کە جائیزن و بۆ خوای گەورە ڕەوان و بوون و نەبوونیان بۆ خوا وەك یەکە،بریتییە لە دەسکاری کردنی خوا لە

کائیناتدا بە فعل و تەرك،زیندوو کردنەوەو مراندن،گەورەیی و شان و شکۆدان و وەرگرتنەوەیان بە هەرکەس و لە هەر کەس،ئەمانە بۆ خودا جائیزن و،هیچ یەکێك لەمانە لەسەر ئەو پێویست نییەو خۆی کاربەدەست و خاوەن ئیختیارە،(یفعل الله مایشا ءویحکم ما یرید)هەروەها هەر کردەوەیەکی حیکمەتێکی تێدایە،ئێمە پێی بزانین یانا..( لَا یُسأَلُ عَمَّا یَفعَلُ وَهُم یُسأَلُونَ)

---

کتێبی مکتوباتی کاك احمدی شێخ ل٤٤٧

# ئەو سیفەتانەی کە پێویستە لە پێغەمبەراندا بن

**ڕاستگۆییئەمانەت و دەستپاکیگەیاندنی ئاین بە خەڵکبەڵگەی بێگومان لەسەر پێویستیەتیی ڕاستگۆیی پێغەمبەران ئەوەیە:کە درۆ لە پێغەمبەرانەوە دەبێتە هۆی درۆ لە وتاری خوادا( تعالی عن علوا كبيرا )، چونکە خوای گەورە موعجیزەی داوە بە پێغەمبەران( د.خ )و، ڕاستگۆیی ئەوانی لەبەردەم هەموو خەڵکدا ئیسبات کردووە، ئەمەش واتە: پێغەمبەران هەرچی دەڵێن ڕاستە و درۆیان لێ ناوەشێتەوە، بێگومان ئەگەر خوا نەخواستە، درۆیان لێ دەرکەوێ، دەچێت بە گژی تەسدسقەکەی خواداو، ئەوەی لێ دەبێتەوە:لەوانەیە ڕاست بکەن و لەوانەیە ڕاست نەکەن، هەروەها دەکێشێتەوە بۆ ئەوەی کەلامی خوای گەورە ڕاست بێ و ڕاست نەبێ..ئەمەش مەحاڵە..بەڵگە لەسەر ئەمانەت و دەستپاکیی پێغەمبەران و گەیاندنی ئەحکام بە خەڵك ئەوەیە ئەگەر ئەم زاتە پاکانە ئەمین نەبن و کردەوەیان حەرام یا مەکرووە بێ دەبێتە هۆی کۆبووونەوەی دوو دژ( جمیع النقیضین )، چونکە لەلایەکەوە ئیتاعە و بە گوێ کردنیان لە هەموو کردەیەکدا واجیبە لەبەرئەوەی کە خوا فەرمانی داوە بە ئیتاعەکردنیان و هەرچی ئەوان کردوویانە پێویستە ئێمەش جێبەجێی بکەین، لە لایەکی تریشەوە پێویستە لەسەرمان لە کردەوەی حەرام و ناڕەوا دووربکەوینەوەو نەشهێڵین خەڵك بیکا، لەم حاڵەدا ئێمە پێویستە ئەو کردەوە حەرامە بکەین کە ئەوان کردوویانە، چونکە ئیتاعەیان واجیبەو، پێویستە نەیکەین چونکە حەرامە!!هەروەها ئەگەر فەرمانی خوا نەگەیەنن و غەیری فەرمانی ئەو**

بگەیەنن،ئێمە لەلایەکەوە دەبێت دوایان کەوین،چونکە دواکەوتنیان واجیبە و،لە لایەك دەبێت دوایان نەکەوین چونکە فەرمانەکە هی خوا نییە؟!ئەو سیفەتانەش کە ڕەوا (جائز)ن بۆ پێغەمبەران (د.خ) بریتین لەوانەی ڕوودەکەنە ئادەمیزاد،وەکو ساغی و نەخۆشی و نووستن و لە خەوهەستان و،حەز لە هەندێ خواردەمەنی کردن و حەزنەکردن لە هەندێکی تر.بەڵێ هەر ڕووداوێك کە لەگەڵ پلە و پایەی ئەواندا ڕێ نەکەوێ:وەك کوێری و کەڕی لە کاتی ڕەوانەکردنیاندا،یا وەك گولی و بەڵەکی و قۆڕی و باقیی ئەحواڵی ناشیرین،ئەوە هەرگیز بۆ پێغەمبەران ڕەوا نییە لە کاتی بە پێغەمبەربوونیان و ڕەوانەکردنیان بۆ سەر خەڵك،بەڵام ئەگەر لە پاش دامەزرانی پێغەمبەریەتییەکە بوو ئەوە قەیناکا.بۆ نموونە:بێ هێزی چاوی حەزرەتی یەعقوب و،ناساغی و برینی لەشی حەزرەتی ئەیوب (د.خ) لە پاش دامەزرانی پایەی پێغەمبەری ئەوان بووەو،مایەی پایە بەرزییان بووەو،پەند و ئامۆژگارییەکی ئاینی بەتین بووە بۆ ئادەمیزادەکانی تر،واتە مادام پێغەمبەران (د.خ) گیرۆدەی ناساغی و دەردی سەری دنیا بین، لەبەر هەر حیکمەتێك کە خوا دەیزانێت ئەوانیش هەروەها گیرۆدە دەبن و،یەزدانی گەورە یاسای دامەزراو و ڕێکوپێکی هەیە بۆ پایەداریی جیهان و ئەهلی جیهان و،لەمەو پێش چۆن هاتووە لەمەو پاشیش هەروەها دەڕوا.ئەی برادەرانی ئاینی!سوێندتان بە خوا دەدەم کە گەلێ جار ئەم مەکتووبانەو ئەم ئامۆژگارییانەی منە بۆ موسوڵمانان بخوێننەوەو،لە ماناکانیان ئاگادار و شارەزایان بکەن،بە تایبەتی بۆ ئەو خوێندەوارانە کە لە پایەی سەرەتاییدان و بە تەواوی پێ نەگەیشتوون و نەگەیشتوونەتە پایەی زاناکان،بەڵکو لە گێژاوی نەزانی دەرچن و بین بە هۆی ڕزگارییان و ڕووکردنیان لە ئاینی پاکی ئیسلام.لەسەر فەرموودەی حەزرەت (د.خ) شارەزایی و ڕێنموونی ئادەمیزادێك بۆ

**سەر ڕێگای ڕاست لە هەموو جیهان و ئەوەی لە جیهاندایە قازانجی زۆرترە.هاوڕێکانی حەزرەت(د.خ) لە مانای ئەم فەرموودەیەدا وایان فەرمووە کە ئەگەر هەرچی لە جیهاندایە موڵکی یەکێك بێ و،هەمووی لە ڕێگای خوادا بەخت بکا.پاداشت و خێری ئەوەی نییە کە مرۆڤێکی گومراه بە قسە و ئامۆژگاری ئەو ڕوو بکاتە ڕێگای ڕاستی ئیسلام..زاناکانیش لە حیکمەتەکەیدا وایان فەرمووە کە جیهان تا سەر نییەو نا پایەدارەو،خزمەتی خەڵك بە ژیواری جیهان خزمەتکردنە بە شتێکی بڕاوە و کۆتاییهاتوو! بەڵام خزمەتکردنی ئادەمیزادێ بە ئاین،واتە:بەو خزمەتە ڕێگای ئاین بگرێتە بەر دەبێتە خزمەتکردن بە شتێك کە هەرگیز نەبڕێتەوە،چونکە بەختیاری و ڕزگاریی ڕۆژی دوایی بڕانەوەی بۆ نییە و هەتا هەتاییە.دوایی باس ئەی برایانی ئاینی!یەکەم هەنگاو بۆ چوونە ناو ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە،بەوە دەبێ کە دوو ڕستەی شەهادەت بڵێی،واتە:((أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمد رسول الله)) دیارە لە ئاینی ئیسلامدا ئەم دوو ڕستەیە کراوە بە دروشمی ئیسلامەتی،چونکە هەرچی بیروباوەڕی موسوڵمانە لە واتای ئەم دوو ڕستەیەدا کۆبووەتەوە:لە وشەی (ئیلاه)دا کە یەکەم وشەیە مەعنای((ئولووهیەت))هەیە،کە بریتییە لە بێ ئیحتیاجی و بێ نیازی بە غەیری خوا،واتە:هیچ کەس نییە کە لە هەموو ڕوویەکەوە بێ نیاز بێ،ئەو خوایە نەبێ کە پەرستراوی بە ڕاستییەو،عیبادەت و بەندەگی هەر بۆ ئەو شایستەیە و هەر ئەو پەروەردگار و ئافەریندەی هەموو جیهانە،بێگومان بێ نیازی و بەکەس موحتاج نەبوون ئەوەی لێ دەردەکەوێ کە ئەو زاتە(واجب الوجود) و قەدیمەو هەر دەمێنێ و،لە هەموو حەوادیسەکان جیاوازەو،بە خۆیەوە ڕاوەستاوەو،لە هەموو کەمی و خەوشێك پاکە و دوورەو،لە زات و سیفەتدا تاکە و،لە کار و کردەوەشدا هەر ئەو خاوەن ئیجاد و تەئسیرەو دروستکردنی جیهان و هەموو ئەندامێکی جیهان لە ژێر دەسەڵاتی ئەودایە..ئەم**

مەعنایە کە لە (ئولووهیەت)ەوە دەردەکەوێ دەبێتە هۆی ئیسباتی هەموو سیفەتە پێویستەکانی خوای گەورە،وەکو لە پێشەوە باسمان کردن و،لە جوملەی ئەوانەیە:زیندوویێتی و زانست و خواست و تەوانایی،بیستن و دیتن و وتوویێژ لەگەڵ ئەو پێغەمبەرانەدا کە بۆ ئامۆژگاریی ئادەمیزاد ناردوونی..هەروەها ئەوەش دەگەیەنێ کە ئەو خوایە لە کردنی هەر کارێکدا کە بیەوێ بیکا و،لە نەکردنی هەر کارێکدا کە نەیەوێ بیکا،خۆی خاوەن خواست و ئیختیارەو،ئارەزووی کردن و نەکردن بە دەستی خۆیەتی.. هیچ شتێك و چاکیی حاڵی هیچ کەس و هیچ گرووهێ لەسەر خوای گەورە واجب نییە،چونکە ئەگەر شتێ لەسەر ئەو واجیب بێ دەبێتە هۆی کەمی بۆ خوا،لە زاتیدا یا لە سیفاتیداو،بەو شتەو بەو کردەوە تەواو دەبێ،یا ئەگەر کەسێکی تر دەسەڵاتی بەسەر ئەودا ببێ و بە خواستی ئەو خوا کارێك بکا،یا واز لە کارێك بهێنێ،ئەمە دەبێتە کەموکورشی و موحتاجی بۆ خوای گەورە (تعالی ألله عن ذلك علوا کبیرا).براکانم!کە باوەڕمان بوو بەوەی هەموو شتێك موحتاجی خوایەو،خوای گەورە لە عالەم بێ نیازەو موحتاجی کەس و هیچ نییە،دەبێ باوەڕمان بەوە ببێ کە هەرچی بێتە وجوود،لە کار و خاوەن کار هەمووی دەگەرشێتەوە بۆ خوای گەورەو،ئەو هەمووی دروست کردوون و دروستیان دەکات((أَللّهُ خَالِقُ كُلِ شَي‌ءِ وَهُوَ عَلَى كُلِ شَي‌ءِ وَكِيل))

واتە:ئەو.کارانە.ئێمە.دەیکەین.وەکوهەستان،ڕۆیشتن،وتوویێژ،نووستن،هاتوچۆ ،ئازاردان،خزمەت،کردنی خەڵك،ڕێز لە خەڵك گرتن و ئیهانە کردن هەموویان دروست کراوی خوان ئەو دروستی کردوون.هەر ئەوەندە هەیە کە ئێمە پەیوەندیی ئیختیار و کەسبمان هەیە لەو ڕەفتارانەدا،چ خێر وەکو نوێژکردن و،چ شەڕ وەکو شەراب خواردن،ئەو کەسانە کە دەڵێن:کارە خراپەکان و کارە شەڕەکان لە بەندەوەیەو خوا دروستی نەکردوون قسەکەیان هەڵەیە،یەکەم:لەبەرئەوە خێر

و شەڕ بە نیسبەتی ئێمەوەیە،واتە:بۆ ئێمە هەندێ ڕەفتار خراپە و تاوان و تاوانبارییەو،هەندێ کاریش چاکە،بەلام بە نیسبەتی خواوەو،بەو چاوەی کە ئەو دروستی کردوون،هەموو وەك یەك وان،دووەم:کە ئێمە تەماشا دەکەین نەخۆش کەوتنمان،مار پێوەدا نمان،لە بەرزیوە داکەوتنمان، کوێربوونمان، هەموو ئەمانە بۆ ئێمە شەڕن و خواش دروستی کردوون، کەس نالێ:من خۆم نەخۆشینی خۆمم دروست کردووە،خۆ ئەگەر خۆی نەخۆشینی خۆی دروست دەکا ئەی بۆچی خۆیشی چاك بوونەوەی خۆی دروست ناکاو،بۆچی جگەر گۆشە خۆشەویستە نەخۆشەکەی خۆی لە مەرگ ڕزگار ناکا؟!هۆی هەرچی کردەوەی شەڕ و تاوانبارییە هەمووی دوو شتە یەکێکیان:نەفس و دەروونی ئادەمیزاد خۆیەتی و،ئەوی تریان شەیتانە،نەفرینی خوای لێ بێ،ئەی بۆچی هەموو کەس دان بەوەدا دەنێ کە نەفس و شەیتان خودا دروستی کردوون،کە هۆی هەموو شەڕ و خراپەیەکیش ئەم دووانەن؟!کەوابوو ڕاستەکەی ئەوەیە کە خوای گەورە دروستکاری چاکە و خراپەیە،بەلام لەبەرئەوەی بەندە ئیختیاری هەیە لەوانەدا خوای گەورە لەسەر کردەوەی چاکە پاداشتی چاکی دەداتەوە و لەسەر کردەوەی خراپ سزای سەختی دەدا،هەروەها ئەو کەسانەش کە دەڵێن:هەموو کردەوەیەکی ئیختیاری،چ چاك و چ خراپ،هەمووی بەندە دروستی دەکات و پەیوەندی خوای پێوە نییە،ئەوانیش بە هەڵەدا چوون و بۆچوونەکەیان بێ بایەخە لەبەر ئەم بەڵگانەی خوارەوە:یەکەم:ئەو کەسەی کە شتێك دروست بکا پێویستە لە کاتی دروستکردنەکەیدا لە ئەندازە و ژمارە و چۆنیەتی ئەو شتە ئاگادار بێت،کەچی ئێمە زۆر باش دەزانین لە چەندیەتی و چۆنیەتی جموجۆڵی جومگەی لەشمانە ئاگادار نین و شتێکی زۆر زۆر کەمی نەبێ خەبەرمان لێی نییە!! تەنانەت ئەگەر یەکێك بە تایبەتی پرسیارمان لێ بکات لەوانەیە نەتوانین وەلامی ڕاستەقینەی بدەینەوە،بەڵکو سەرسامیش دەبین!!دووەم:ئێمە ئەگەر خۆمان ئەو

ئیشە باشانەی خۆمان دروست کردبایە دەبووا بمانتوانیایە لەو جۆرەی کە دەیکەین زۆر چاکتر و جوانترمان دروست بکردایە،بە شێوەیەك کە کەس لێمان پێش نەکەوتـایە،کەچی هەموو کەس دەزانیٚ ئەگەر زۆریش هەوڵبدا نـاتوانیٚ لەو ئەندازەی کە دەیکا زیادی بکات لە ڕێگا ڕۆیشتندا،لە نووستندا،لە قسەکردندا...هتد سێیەم:ئەگەر توانـای دروست کردنی کردەوەی خۆمان ببوایە،دەبووا هەرگیز پێزۆیستمان بە یارمەتی کەس نەبوایە،چونکە هێزی دروست کردن پێویستە تەواو بیٚ،خۆ ئەگەر دەڵیٚ هێزی بەندە کزە و تەواو نییەئەوە پێی لیٚ دەنێیت کە هێزی بەندە بە کەڵکی دروست کردن نایەت،تەنیا بۆ کەسب و پەیوەندییە بەو کارانەوە کە خەریکیان دەبیٚ چوارەم:ئەگەر بەندە ئیشی خۆی دروست کردبایە دەبووا مرۆڤی موسوڵمان هەرگیز ئیشێکی نابـاری تـاوانی بۆ خۆی دروست نەکردایە،کە لە پاشەڕۆژدا پێی گیرۆدە ببیٚ و،دەبووایە هیچ مرۆڤێکی شارستانی کردەوەیەکی وەهای نەکردایە کە لەگەڵ یاسا و نەریتدا نەگونجیٚ،چونکە هیچ کەس بەوە ڕازی نـابیٚ کە شەرمەزاری بەردەمی گەورەی خۆی ببیٚ،بەڵام ئەگەر بەندە کاسب بیٚ،وەك ئێمە بـاوەڕمان پێیە،ئەوە وا دەبیٚ کەسبەکەی لەسەر داوای نەفس و ئـارەزوو بـازی دەڕوات و،دەبێتە هۆی ئەوە کە خوای گەورە لەسەر ئەو کەسبە تـاوانبارییەکەی بۆ دروست بکا.هەروەها ئەو بیرەش کە دەڵیٚ:ئـادەمیزاد بیٚ چارەیەو،وەك دار و بەرد وایە،توانـای خۆ لادانی لە شەڕ بۆ خێر و لە خێر بۆ شەڕ نییە،ئەویش هەر هەڵەیە لەبەر ئەم چەند هۆیانە:یەکەم:هەموو مرۆڤێکی ژیر دەزانیٚ کە ئەگەر یەکیٚ نەخۆش بکەویٚ و لەرزی لیٚ بیٚ نـاتوانیٚ نەلەرزیٚ یا ئـارام ببیٚ،بەڵام ئەگەر بە ساغی خۆی بلەرزێنێتەوە بە ئـارەزووی خۆی،دەتوانیٚ بلەرزیٚ یا ئـارام بیٚ،ئەمە بە ئـاشکرا بەڵگەیە لەسەر فەرقی کردەوەی نـاچاری و کردەوەی ئیختیاری.دووەم:ئەگەر مرۆڤ هیچ چارێکی نەبووایە لە چاك و خراپی

کردەوەیدا دەبووا لە هیچ کردەوەیەکی خۆیداو،لە زیاندانی لە خەڵکدا مەسول نەبووایەو،دەبووا خەتاکاری و تاوانباری لە جیهاندا نەبووایە؟!سێیەم:دەبووا یاساکانی جیهان و قانوونەکان،چ ئاینی و چ دنیایی،بێ سوود بوونایە،چونکە یاسا و قانوون بۆ ئادەمیزادی خاوەن خواست و خاوەن هێز و تەوانایەو،دار و بەرد یاسا وەرناگرن؟!کەوابێ ڕاستەکەی ئەوەیە کە مرۆڤی ژێر هێزی ژیان و زانست و خواست و توانای ئەوەندەی هەیە کە ڕوو بکاتە چاکە و خراپە و فەرقیان بکات و،کە ڕووی کردە هەر شتێ خوایش بە قودرەتی خۆی بۆی دروست دەکا و،لەسەر مەیلی کردەوەی خێر پاداشتی باشی دەداتەوە لە دنیا و قیامەتداو،لەسەر کردەوەی خراپ پاداشتی ئازار و سزای پێدەدات لە دنیا و لە قیامەتدا.. ئەم مەیل و خواستی بەندەیە دەبێتە هۆی عادەتی بۆ ئەوەی کە خوای گەورە ئەو کردەوەی بۆ دروست بکا،وەکو چۆن گەرمی ئاگر هۆی عادەتییە بۆ سووتانی شتێك،یا سەرما هۆیە بۆ وشکبوونی شتێك.. هەروەها ئەسبابەکانی تریش،کە خوا دروستی کردوون ،هەموویان هۆی عادەتین،واتە:عادەتی خوای گەورە وەها ڕاهاتووە کە ئەو هۆیانە ببنە هۆی چەند شتێك،ئەگینا نە ئاگر دروستکەری سووتاندنەو،نە سەرما خالقی وشککردنە،وەکو مەشهوورە ((ان أللة يخلق المسيات عند الاسباب لا بها))گەلێ جاریش خوا ئەم عادەتە تێك دەدا،ئەوە بوو ئاگر ئیبراهیمی خەلیلی نەسووتاندو...گەلێ شتی تری وەهاش لە جیهاندا ڕووی داوە..هەندێکیش هەن دەڵێن:خوای گەورە وای موقەدەر کردووە کە فلاّن فلاّن بکوژێ و،کەسێك ماڵی کەسێکی تر داگیر بکا،یا فلاّن نوێژ بکاو،فلاّن نەیکات و،تەقدیری خوا پێویستە بێتە جێ،ئیتر چارەمان چییە؟! ئەم قسەش زۆر زۆر هەڵەیە و لە نەزانینەوەیە،چونکە تەقدیری خوا یانی ئیرادە و خواستی خوا،لەسەر زانستی خۆی دەڕواو،خوایش لە ئەزەلدا ئەوەی زانیوە کە فلاّن کەس دروست دەکا و هۆش و بیری دەداتێ و،دین و ئاینی بۆ ڕەوانە

دەکا و،لە لایەنی زانایانی ئاینیشەوە ئامۆژگاری وەردەگریٚ و ئەو کەسەش مرۆڤێکی خاوەن هەست و خواستەو،بە ئارەزووی خۆی لەو کاتە دیارییەدا فلانە کار ئیختیار دەکا،کە پیاو کوشتنەو،گویٚ بە یاسای عەقلٚ و ئاین نادا،ئیتر تەقدیر مەعنای ئیجبار و زۆرکاری نییە،ئەگەر تەقدیر مانای ئیجبارە،بۆچی کە یەکێك ماڵت بخوا،یا کەسێك بکوژیٚ بەگژیا دەچی و بە مەسوولی دەزانی؟!ئینجا کە ئیختیاری ئادەمیزاد مایەی کردەوەی خێر و شەڕ بیٚ، پێویستە هەرکەس ئەمڕۆ کردەوەی چاك بکا سوپاسی خوا بکاو،هەرکەس کردەوەی خراپ بکات خۆی سەرزەنشتی خۆی بکا.برایانی ئاینی! پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانیٚ پێویستیەکانی بیروباوەڕی ئاینی خۆی بزانیٚ،هەروەها پێویستە لەسەری کە هەموو پێویستیەکانی عیبادەت،وەکو نوێژ و ڕۆژوو و ئادابی،بەقەدەر حاڵی خۆی بزانیٚ،واتە :سەبارەت بە بیروباوەڕ بەوە بزانیٚ کە خوا و فریشتە و پێغەمبەران هەن و،خوا کتێبی بۆ پێغەمبەران ناردووە،ئەوانیش بە خەڵکیان ڕاگەیاندووە،بەوە بزانیٚ کە پێغەمبەری خۆمان حەزرەتی ( محمدالمصطفى )دروودی خوای لەسەر بیٚ،بۆ سەر هەموو پەری و ئادەمیزادی جیهان بە پێغەمبەریی ڕەوانە کراوەو،ئەو دوایی پێغەمبەرانەو،لە پاش ئەو پێغەمبەری تر نابێت،هەروەها دەبیٚ باوەڕی بەوە هەبیٚ کە هەرچی لە جیهاندا هەیە خوای گەورە دروستی کردووە، پێویستە باوەڕی بەوە هەبیٚ کە ئێمە هەموو لە پاش مردن زیندوو دەکرێینەوەو ڕۆژی قیامەتی نەبڕاوە دێتە مەیدانەوەو، پاش حسابی کردەوە لە ڕۆژی قیامەتدا ئەوەی کافر و بیٚ باوەڕ بووبیٚ دەخرێتە دۆزەخەوە و هەتا هەتایە تیایا دەمێنێتەوەو ئەوەیش خاوەن بیروباوەڕی پەسەند بیٚ و موسوڵمان بیٚ،ئەگەر بیٚ تاوان بیٚ زووبەزوو دەبریٚ بۆ بەهەشت،ئەوەش تاوانباربیٚ یا خوا بە گەورەیی خۆی لێی دەبووریٚ و دەیبەخشیٚ،یا بەقەدەر گوناهەکەی لە دۆزەخدا ئازار دەدریٚ و لە پاشان لە

**دۆزەخ دەردەکریٚ و بەرەو بەهەشت بەڕیٚ دەکریٚتەوەو،هەتا هەتایە لە ئاسایش و ناز و نیعمەتدا دەمێنیٚتەوە..هەروەها پیٚویستە هەموو کەس فیٚری ئاداب و یاسای نویٚژ و ڕۆژوو و ئەحکامەکانی تری ئاین ببیٚ،وەك پیٚویستە لەسەر ئەوانەی کاسبی دەکەن کە بە گویٚرەی ئیش و کارەکەیان لە یاسا و ئادابی ئاین ئاگاداربن،ئەگینا بە تاوانبار دەناسریٚن.واتە :بە کورتی مرۆڤ بە دوو ڕستەی شەهادەت کە بە زمان دەلٚیٚ:( اشهد ان لا اله الا الله،واشهد ان محمد رسول الله ) دەچیٚتە نیٚو زومرەی موسولٚمانان و لەوان حسیٚبە،بەلاٚم لە پاش ئەوە پیٚویستە لەو ئاداب و یاسایە کە بەڕووناکی لە دیندا زانراون و ئاشکران بەقەدە ر پیٚویستی خۆی خەریکی فیٚربوونیان ببیٚت،ئەگەر هات و قصووری کرد و فیٚر نەبوو ئەوە بە موسولٚمانیٚکی فاسیق دەناسریٚ و،ئەگەر تیٚکۆشی و فیٚری واجیباتی ئاینی خۆی بوو،ئەوە بە موسولٚمانیٚکی باش دەناسریٚ و،لای خوای گەورە پایەی بەرز دەبیٚ.زۆر تکا دەکەین لەو خویٚندەوارانە کە خاوەن قابیلییەت و توانانلە ئەمر کردن بە چاکە و نەهی کردن لە خرا پەدا کۆتایی نەکەن و،ئەم نامەی بیروباوەڕەش بۆ موسولٚمانان بخویٚننەوەو،بە زمانیٚکی شیرین تیٚیان بگەیەنن و،ڕیٚگای ڕاستی ئاینی پیرۆزی ئیسلامیان پیشان بدەن،چونکە موسولٚمانان برای یەکن و،چیٚویستە برا بەزەیی بە برای خۆیدا بیٚتەوەو رەحمی بۆی هەبیٚت.هەروەها تکا لە برایانی ئاینی دەکەین کە هاوڕیٚیەتی و هاودەمی زانایانی ئاینی بکەن و،هاوڕیٚیەتییان بە هەل بزانن و،لەسەر فەرمانی ئەوان ڕەفتار بکەن.**

---

١- کتیٚبی مکتوباتی کاك احمدی شیٚخ

# ئایا لەم دەقانەدا خوا دەدوێنرێت ؟

**( مزمور ١٠: ١ )**

**خودا یە ! بۆچی دور ڕادەوەستی ؟ بۆچی لەکاتی تەنگانەدا خۆت ون دەکەیت ؟**

**( مزمور ٨٩: ٤٧ )**

**خودایە ! هەتاکەی خۆت دەشاریەوە ؟ هەتاکەی توڕەییت وەك ئاگر هەڵدەگیرسێ ؟**

**( مراسي ٣: ١٨ )**

**متمانە و هیوام بە خوا نەماوە**

**( ا شعیا ٦٣: ١٧ )**

**خودا یە ! بۆچی لەڕێی خۆت گومڕات کردین ؟ لەترسی تۆ دڵ ڕەقت کردین .**

**( مزمور ٣٥: ١٨ )**

**خودا یە ! هەتاکەی هەر تەماشا دەکەی ... ئەوانەی دوژمنمن با بە ناحەق پێم خۆش نەبن . بە ئاگا وەرە و ئاگاداری حوکمم بە .**

**( مزمور ٤٠: ١٧ )**

**ئەی خودای من خاو مەبە . ( خروج ٥: ٢٢-٢٣ ) بۆچی خراپەت بەرانبەر بەم گەلە کرد ؟ بۆچی منت نارد ؟ تۆ دڵسۆزی گەلەکەت نەبوی .**

# تۆمەت بارکردنی مەسیح لەلایەن قوتابیانەوە بە هەڵوەشانەوەی نیگا (ناموس)

( اعمال ٢١ : ٢٠-٢١ )

پێیان گوت : (( كۆمەڵە جولەكەیەك بڕوایان هێناوە گشتیان بۆ نیگا ( ناموس ) بە غیرەتن . سەبارەت بەتۆ رایان گەیاندوە تۆ دەزانی كە هەموو جولەكە لە موسا هەڵگەڕاونەتەوە و گوتوتە منداڵەكانیان خەتەنە نەكەن

---

١ : مەبەستیان لەم زاراوەیە ، پینج سیفرەكەیە كەبەسەر موسا دابەزی (PENTATVSH) كەبریتین لە : التەكوین ، الخروج ، اللاوین ، العدد ، التسنیە

# ئائەمە بێزاری خۆی بەدەر دەخات

( ٢ تیمور ٤: ١٤ — ١٦ )

**بە هاورێییەکی دەڵێ : (( تۆ دەزانی هەموو ئەوانەی وا لە ( ئاسیا ) ن لەمە هەڵگەڕاونەتەوە . ئەسکەندەری مس ساز خرا پەی پیشانداوم تا خودا بە پێی کردەوەکانی پاداشتی بداتەوە .... هەروەها تۆش خۆت لێی بپارێزە ، چونکە بەرگری وتەکا نمانی کردوە .... لەیەکەم ناڕازیم کەس لەگەڵم ئامادە نەبوو . بەڵکو گشتیان بەجێیان هێشتم**

# بە گومان بونی ئەسفەفەکانیش بەلەدایك بوونی مەسیح

**لە تێڕوانینێکی سەرسامکەری قەشەکانی ئینجیلەکانی لە مانگی یۆنینۆی (١٩٨٤) دەرکەوت کە (٣١) قەشە لەکۆی (٣٩) قەشە کلێساوا تێدەگەن کە موعجیزەی مەسیح تاییەت بە ( لەدایك بوونی لە ـ مریەم ـ کچ و ـ هەڵستانەوەی لەنێوان مردووان لەوانەیە بەم شێوەیە نەبێت کەئینجیل باسی لێوە دەکات**

**لە ئینجیلی یوحەننا (١٣،١٦)**

**کاتێك کە ڕوحی ڕاستی دێت** (١) **بەرەو هەموو ڕاستیەکانتان دەبات.**

---

١-ئایە مە بەست لەم ڕۆحە ڕاستە کیە بە ڕاستی من پێم وایە ئەمە لەگەڵ پیغەمبەر محمد یەتی مەسیحیەکان خۆی لێ کەڕدەکەن

لە (سفر ئەشعیا ۲۹/۱۲/ خوا بەمووسا دەڵێت کتێبە کە دەدرێنە ئەو کەسە ی کە نوسین نازانێت پێی دەوترێ بخوێنە دەڵێت نازانم.

**مەسیحیەکان دەڵێن ئەو ئایەتە مەبەبست عیسایە؟**
**بابزانین محمد و موسا وعیسا لەیەك دەچن**
**عیسا خوایە لە لاشەدا. بەلاّم موسا خوا نیە ؟ وە محمد یش خوانەبو**
**عیسا مرد لە پێناو تاوانەکانی جیهان بەلاّم موسا نەمرد؟ محمد یش نەمرد لە پێناو تاوانەکان**
**عیسا چوە دۆزەخ بۆ ماوەی سێ رۆژ بەلاّم موسا داوای چونە دۆزەخی لێنەکرا. محمدییش نەچو**
**عیسا دایکی هەبوو باوکی نەبوو بەلاّم موسا دایك و باوکی هەبوو. محمدییش دایکو باوکی هەبوو**
**عیسا بەبێ باوك لەدایك بوو بەلاّم موسا بەشێوەیەکی سروشتی لەدایك بوو. محمدییش بەشێوە سروشتی**
**عیسا ژنی نەبوو هەتا ئێستا بەلاّم موسا ژن و منداڵیشی هەبوو. محمدییش هەی بووە**

**عیسا خەڵکی چاك ئەکردەوە مردوی زیند وو ئەکردەوە بەلاّم موسا وانەبوو. محمدییش وانەبوە**

**عیسا سەرکردە نەبوو بەلاّم موسا سەرکردەبوو. محمدیش سەرکردە بوە**

**عیسا شەریعەتی تەواو کرد بەلاّم موسا شەریعەتی تازەی هێنا. محمدیش شەریعەتی تازەی هێنا**

**عیسا لەسەر خاچ گیانی لەدەست دا کوشتیان بەلاّم موسا بە سروشتی مرد.هەروە ها محمدیش هەر بەسروشتی خۆی مرد**

**عیسا لەلای ڕاستی خواوە دادەنیشێت بەلاّم موسا قەبرەکەی لەسەر زەوییە.هەروەها محمدیش**

**عیسا قسەی لەگەڵ خوانە دەکرد خۆی قسەی ئینجیلی کردووە بەلاّم موسا لەکێوی تور لەگەڵ خوا قسەی ئەکرد. محمدیش لەکاتی ئسراو معراج قسەی لەگەڵ خواکردوە**

## قەبلە سوفی بەرنانی (پەرنا دشۆ)

**دەڵێت لەو بڕوایەدام کە دەسەلاّتی تەواوی هەموو جیهان بدرێتە دەست. پیاوێکی وەك ( محمد ) دەیتوانی سەر کەوتن بەدەست بهێنێت لە دەسەلاّتەکەیدا و هەموو جیهانیشی بەرەو چاکە دەبردوو کێشەکانیشی بەشێوەیەك چارە سەر دەکردن کە ئاشتی و بەختیاری بەدی دەهێنا .**

# بەپێی حوکمی خودا
# سێ ساڵ برسێتی یان حەوت ساڵ؟
# صموئیل ٣(١٣:٣٤)

**جاد هات بۆلای داوود بۆ باسکردو ووتی :حەوت ساڵ برسێتی لەخاکی خۆتا بێت بەسەر تا یاخود سێ مانگ لەبەر دوژمنەکانت هەڵبێیت و ئەوا ئەوانیش بەدواتەوە بن ؟**

**سفر الاخبار الايام الاول ( ١١:٣١ )**

**جاد هات بۆ لای داوود و هەروەها پێوت ووتی سەرپشك ئەکرێت یان سێ ساڵ برسێتی یان سێ مانگ دوژمنەکانت هەڵدبێت و شمشێری دوژمنەکانت ئەگاتێ ..... ))**

**ئەگەر خودا دانەری هەموو وشە نێوبڕ و خاڵێك بێت لە کتێبی چیرۆزدا وەکو مەسیحیەکان بانگەشەی ئەکەن ئەی ئەگونجێ دانەری ئەو دژیەکیە بیرکارییەی سەرەوەش؟!**

**٧٠٠ یان ٧٠٠٠**

**ئەوانەی کتێبی پیرۆزیان خۆش ئەوێ نارەحەتن بە لا چوونی ژمارە سفرەکە لەحەوت سەد زیاد بوونی لەحەوت هەزاردا، چونکە ڕاستیەکە بیری ماتماتکیستەکانی کتێبی پیرۆز تووشی شێواوی کردووە .**

**صموئیل ٣( ١٨:١٠ )**

**ئارامیەكان شكان لەبەردەم ئیسرائیلدا،وە داوود لە ئارامییەكان حەوت سەد مركبە و چل هەزار سواری لیّ لە ناوبردن،وە ( شوباك )ی سەرۆكی سوپاكەی داوود لەوێدا مرد ))**

**سفر الاخبار الايام الاول١٨-١٩**

**ئارامییەكان شكان لەبەردەم ئیسرائیل وە داوود لە ئارامییەكان حەوت سەد مركبە و چل هەزار پیاو لیّ لەناوبردن و(( شەفاك ))ی سەرۆكی سوپاكەی كوشت ))**

**صموئیل( ٣ ) ( ١:٣٤ )**

**(( خودا لەبەنی ئیسرائیل تورە بوو و داوودی لیّ هاندان ووتی برۆ ئیسرائیل و یەهوزا قرکە )) لەكاتێكدا دانەری صموئیل ( ٣ )ی ( ١:٣٤ )ی سەرەوە پێمان دەڵێت :خودا خاوەنی هەڵویستەكەیە .**

## خودا جیاوازی نێوان سوارەو پیادە نازانێت

**شێواوی بیری دانەرەكان لێرەدا لەجیالكردنەوەی سوارە وپیادەدا شتێكی زۆر مەترسیدارە ،چونكە خودا ئەخاتەبەر گومان و تاوانباركردن ،چونكە ئەو سەرچاوەی نیگا و سروشە و جیاوازی نێوان سوارە وپیادە بۆ نەكراوە یان لەوانەیە ئارامییەكان لە ئاژەڵی ((القنتورس)) هەڵهاتبێت كە ئاژەڵێكی خورافی داستانە گریكییەكان و نیوەی سەرەوەی لە شێوەی پیاودایە و نیوەی خوارەوەش لە شێوەی ئەسپدایە .تۆبڵێت ئەم ئاژەڵە خەیاڵییە خۆیان پیشانی نوسەرە ساویلكەكان دابێت**

# سوار یان پیادە؟

**بڕوان دوو نموونەکەی پێشتر و بەراوردێك بکە لەنێوان دوو ڕستەکەدا ،ژمارەی ئەو مرکەبانەی چەندە کە داوود تێکی شکاندوون ؟حەوت سەدە یان حەوت هەزار ؟جگە لەوەش ئایا چل هەزار سوارەی کوشتووە یان چل هەزار پیادە ؟ئەم جیاوازییە لەنێوان (صموئیل ٣\١٠:١٨)وە سفر الاخبار الایام الاول (١٩:١٨) بەتەنها ئەوە ناگەیەنێ کەخودا سەدان هەزاران لەیەك جیا ناکاتەوە ،بەڵکو لەوە زیاتر مانای وایە کە جیاوازی نێوان سوارە و پیادەش تازانێت! دیارە کە کفرو درۆهەڵبەستن لەفەرهەنگی مەسیحیەتداخۆی لەبەرگی (نیگا)و( سروش)دا شاردۆتەوە!!!**

# هەولێکی ناکە کەسی

**سولە یمان (علیەی صلات والسلام) توانیویەتی کۆشکێکی شاهانە بنیان بنێت ،کە دروست کردنی ماوەی ((١٣))ساڵی پێچووە ،ئەم زانیاریەش بەشی حەوتەمی(سفر الملوك الاول)) پێمان ڕادەگەنێت بیرتانە،د.پارکەر شانازی بەچیەوە ئەکرد ((چەندەها پەڕەی تەواو کە پڕیەتی لەناوی نامۆ و پەنهانە ))ئامۆژگاریت ئەکەم کە((سفر الملوك الاول /بەشی حەوتەم ))لەگەڵ ((پێشبینەکەی حەزقیان /بەشی ٥٤))تەنها بۆ جارێك لەژیانتدا بخوێنێتەوە ،تاوەکو نرخ و ڕێزی قورئان پیرۆز زیاتر بێت لات**

# خودا سزایان دەداو تۆشی زینایان دەکات

**( حزقيا ٢٣: ٢٢-٣٥ ) ئەی اهوليبا لە پێناو ئەمەدا خودا گوتی: عاشقەکانت لێ هارو هاج دەکەم جلەکانت لەبەر داکەنن و .... بەڕوت و قوتی جێت بێڵن .. ئەوکاتەش شەرمگە و زينا و کارە ناشيرينەکەت بە دەردەکەوێ کاسەی سەر سامی و ماڵ وێرانی لەسەر خۆشی و خەمناکی پڕ دەکەی و .. دەيخۆيەوە و دەی مژی و بەلايەکی ددانتەوە دەيگری مەمکت لەبن ڕا لێدەکەيەوە لەبەر ئەوەی قسەم کرد ئەوا هات و لە پێناو ئەواندا خۆت شوشت و چاوت ڕشت و خۆت بە خشڵ ڕازاندەوە لەسەر تەختە بەنی گران بەها دانيشتی .. سەبارەت بەزينا کردنی ( باليە ) گوتت: ئێستا زينای لەگەڵ دەکەن ( عاموس٧: ١٦-١٧ )خودا بە ( مصيای ) گوت: تۆ دەڵێی هەواڵ لەسەر نەوەی ئيسرائيل مەدە لەبەر ئەوە خودا گوتی : لەشاردا ژنەکەت زينا دەکات و کوڕ و کچەکانت بە شمشێر دە گلێن .**

**( ارميا٨ :٩-١٠ ) وشەی خودايان ڕەت کردەوە ... لەبەر ئەوە ئافرەتەکانيان درانە کەسانی تر و کێڵگەکانيشيان درا بە موڵك داران چونکە لە بچوکەوە بۆ گەورانن هەر يەکێك لەوان شەيدای دەسکەوتی پێغەمبەر بون کە دەدرايە فاڵچی ( کاهن ) ( اشيعا٣ :١٦-١٧ ) خودا گوتی: لە پێناو ئەوەی کچانی ( صهيون ) خۆ بە گەورە دەزانن و بە گەردنی درێژەوە دەڕۆن و بە چاوەکانيان تانەو تەشەر دەدەن لەڕۆشتنيان دەست بەرز دەکەنەوە خشەخش و تەقەتەق پێيەکانيان دێنن گورە**

**پیاوان بەژن و بالأی کچانی ( صهیون ) بە دیار دەخەن خوداش شەرمگەیان ڕوت دەکات.**

**( ارمیا۱۳: ۲۲-۲٦ ) لەبەر گەورەیی گوناهەکەت دامێنت هەتك کراو پاشەڵت و... خراپە کاری و قیێژە و کاری ناشیرنی زینات بەدەر کەوت دامێنت هەڵدەدەمەوە سەر ڕوخسارت و ڕسوایت دەبینرێ**

**( ناحوم۳ :٤-٥ ) لەبەر زینا کردنی ئافرەتێکی جوانی زینا کەری سیحراوی کە چەند نەتەوەیەك بە زیناکەی دەفرۆشێ بە سێحراویەکەی چەند هۆزێك دەفرۆشێ ئا لەو کاتەدا خودای سەر بازان پێت دەڵێ : تا سەر دەموچاوت دامێنت هەڵدەدەمەوە شەرمگەشت پیشانی نەتەوەکان دەدەم.**

**( تسنیه۲۸ :۱٥ ) بە هەڕەشەوە خودا بە نەوەی ئیسرائیلی گوت: گەر گوێ بیستی دەنگی پەروەر دگار کە خوداتە نەبی هەموو نەفرینێکت دێتە سەر ژنێك دێنی و پیاوێکی تر سەر جێی لەگەڵدا دەکات.**

**( هوشع ۲ :٤-۷ ) دایکتان دادگای بکەن چونکە ژنی من نیە و منیش مێردی نیم بۆ ئەوەی زیناو خراپە کاریەکەی لە نێو مەمکەکانی لەسەر خۆی لابدات نەبادا ڕوتی بکەمەوە و بەرامبەر بە منداڵەکانی میهرەبان نەبم چونکە منداڵی زینان .. ئیستاش لەبەر چاوی عاشقانی شەرمگەی بەدەر دەخەم.**

---

**۱- ئافرەتی زیناکەر بە هەڕەشەکردنی لە بەدەرخستنی شەرمگەو دانە دەست عاشقانی ناترسێ بەڵکە پێی خۆشەو هەوڵیشی بۆ دەدات جا ئایە بە ڕاستی خودا بەم شێوازە سزای ئافرەتی زینا کەر دەدات؟ -۱ .بنیامین چەند ساڵ هەیە لەتکوین بەشی ٤٦ ئایەتی ۲۱دەڵێت دە مناڵی هەیە ﴿بالغ – باکر –اشبیل – جیرا- نعمان – الحیی – روش – مقیم –حفیم – ارد﴾.**

**۲-.لە اخباری ایام الاول بەشی حەوت ئایەتی شەش دەڵێ سێ مناڵ هەیە ﴿بالع – باکر- یدیعئل﴾.**

**۳-.لەاخباری بەشی هەشتدا ئایەتی یەك دەڵێت پێنج منداڵ هەیە ﴿بالع – اشبیل – اخرج – نوحە – رافا ﴾.**

**.بالع لە اخباری ایام الاول بەشی حەوت ئایەتی حەوت دەڵێ پێنج منداڵی هەیە ﴿اصیون –عزی –عیری – عزیئیل – یریمون ﴾وە لە اخباری الاول بەشی هەشت ئایەتی سێ دەڵێ نۆ منداڵی هەیە ﴿ادار – جیرا – ابیهوا –ابیشوع – نعمان – اخوخ – حیرا – شفوفان – صورام ﴾**

# چەند وونەیەك سیفەتی پیرۆزی هەڵبناگری خودا فرمانی بە(حزقیال) دەکات نانی گەرم لەسەر پیسایی ئادەمیزاد بخوات

**( حزقیا٤ :١٢-١٥ ) خودا بە ( حزقیای ) گوت : کێکی لە جۆ دروستکراو لەسەر ئەو پیساییە دەخۆی کە پاشە ڕۆی مرۆڤە لەبەر چاویان دروستی دەکەی ... ئابەم شێوەیە نەوەی ئسڕائیل نانی پیسایی دەخۆن گوتم: ئاە ئەی خودای گەورە دەرونم پیس نەبوە هەر لەمنداڵیەوە تا ئێستا نە گۆشتی مرد و نە نێچیرم خواردوە نە گۆشتی پیس بەدەم کەوتوە پێی گوتم : بڕوانە تە پارەم لەجیاتی پیسایی بۆت دانا تا نانی لەسەر دروست بکەیت.**

## پیسایان دەخۆن و میزیان دەخۆنەوە

**( ٢ملو ١٨:٢٧ ) ( ریشاقی ) گوتی: ئەدی نابێ ئەو پیاوانەی کە لەسەر پەرژینەکەی دانیشتون لەگەڵ ئێوە پیساییان بخۆن و میزیان بخۆنەوە ؟**
**دەستەواژەی حەرام زادە ( زۆڵ )**
**( تسنیە ٢٣ :٢ ) کوڕی زینا ناچێتە کۆمەڵی خودا.**
**( عبران١٢ :٨ ) ئێوە حەرام زادەن .**
**عبران١٢ :٨ ) ئێوە حەرام زادەن ئەسڵ زادەنین .**

# چۆن مێردەکەی رزگاری کرد

**تسنیە ٢٥ :١١-١٢ ) ئەگەر دوو برا لەگەڵ یەك بەشەڕ هاتن و ژنی یەکێکیشیان هات بۆ ئەوەی پیاوەکەی لە دەست نە یارەکەی رزگار بکات دەستی درێژ کرد و شەرمگەی پیاوەکەی گرت چاوت نەترسێ دەستی ببڕە .**

---

**١/بە پێی.نوسخەی.( good news bible ) لە بەندەکانیدا دێ دەبینی چۆن ئەو وشەیە لادەبر درێ و دەسکاری دەکرێ چونکە ئەوان دەزانن جوان نیە ئەم وشە شەرمندەیە لەکتێبی خودا هەبێت.**

# گوزارش کردن لە کتێبی پیرۆزدا

**( جامعه ٣ :١-٧ )هەموو شتێك كاتی خۆی هەیە هەموو كاروبارێكیش لەژێر ئاسمانەكان كاتی خۆی هەیە . لەدایك بوون كاتی خۆی هەیە مردن كاتی خۆی هەیە. چاندن كاتی خۆی هەیە دروێنە كاتی خۆی هەیە. گریان كاتی خۆی هەیە پێكەنین كاتی خۆی هەیە . شینو ڕۆڕۆ كاتی خۆی هەیە سەما كردن كاتی خۆی هەیە. پەرت كردنی بەرد كاتی خۆی هەیە كۆكردنەوەی بەرد كاتی خۆی هەیە. لە ئامێز گرتن كاتی خۆی هەیە لە ئامێز نەگرتن كاتی خۆی هەیە . شت دڕاندن كاتی خۆی هەیە شت دورینەوە كاتی خۆی هەیە .**

**( جامعه ٧ :١-٣ ) ڕۆژی مردن لەڕۆژی لەدایك بوون باشترە . چۆن بۆ ماڵێك شین و ڕۆڕۆی تێدا بێ لە چۆن بۆ ماڵێ زەماوەندی تێدابێ باشترە . خەمباری لە پێكەنین باشترە . چونكە ڕوخەمۆكی چاك سازی دڵ دەكات .**

**( ایوب ٣٥ :١٠-١١ ) خودا كردگارمە گۆرانی هێنی شەوانە كە لە دڕاندەكانی زەوی زیاتر فێرمان دەكات لە باڵندەكانی ئاسمان پتەوترمان دەكات .**

**( اصمو ٢ :١-٣ ) ( حنه ) گوتی : قۆچم بەهۆی خوداوە بەرز بوو دەمم لەسەر دوژمنانم گەورە بوو .. هیچ بەردێك وەك خودامان نیە ... دڵڕەقی ملهو ڕان تێكشكا چەوساوانیش باسی تەنگانەیی و نەداریان كرد .**

## ناشرین کردنی بەزەیی خوا لە کتێبی پیرۆز دا (تۆڵەسەندنەوەو شمشێرو کوشتن) و پێچەوانەی خۆشەویستیە

**( عبران ١٢ : ٢٩ ) خوامان ئاگرێکی خۆرەیە.**

**( مزمور ٩٤ : ٢١ ) خودایە ئەی خوای تۆڵە و سزا ، ئەی خوای تۆڵەی و سزا .**

**( ایوب ٧ :٢١ ) بۆچی لەگوناهم خۆش نابی و گوناهم ناسڕیتەوە .**

**( حزقیا ١١ : ٨ ) ئێوە لەشمشێر ترسان ، کەچی شمشێر د ێنمە سەرتان .**

**( عاموس ٩ : ١ ) دوا کەسیان بە شمشێر دەکوژم . فەرمان بە شمشێر دەکەم ، ئەویش دەیان کوژێ .**

**( ارمایا ٤٩ : ٣٦ ) شمشێر بە دوادا دەنێرم .**

**( حزقیا ١٢ : ١٤ – ١٥ ) شمشێریان بە دوادا هەڵدەکێشم لە بەر شمشێر وبرسێتی و نەخۆشی چەند پیاوێکیان دەهێڵمەوە**

## خواردنی گۆشتی منداڵەکان لەلایەن دایکانەوە

**( ارمیا ١٩: ٩ ) خوا وتی : گۆشتی کوڕ و کچەکانیان دەرخوارد بدەن ، ئەوانیش هەریەکە و گۆشتی هاوڕێکەی دەخوات وتیشی : گەر گوێڕایەڵم نەبن شمشێرێکتان بۆ دێنم کەتۆڵەی سزای پەیمان ( میپاق ) تان لێ بکاتەوە**

**( لاوی ٢٦ : ٢٩ ) اەنێوەندتاندا نەخۆشی ناردراوە و بەدەستی دوژمن لەنێو دەچن ، جا گۆشتی کوڕ و کچەکانتان دەخۆن**

**( مرا پی ٤ : ٤ – ١٠ ) ئەی خودا سەرنج بدە ، بەکێ ئاوات کردوە ؟؟؟ ئایا ئافرەت بەری منداڵی دایەنگە ( حضانه بخوات ؟**

**( مراثی ) ئافرەتی شیردەر لەبەر تویننوێتی زمانی بە مەلاشویەوە نوساوە ... وێنەی منداڵەکان زۆر ڕەش هەڵگەڕاوە ... پێستیان بە ئێسقانەکانیان نوساوە ... ئافرەتان بە دەستی بە سۆزیان منداڵی خۆیان کردۆتە چێشت ، منداڵکان بونە خواردنی دایکیان .**

**ئاگر و شمشێر لە ئینجیل ( العهد الجدید ) دا**

**( مەتتا ١٠ : ١٤ ) مەسیح ووتی : وا مەزانن من هاتووم ئاشتی بەرپا بکەم . بۆ ئاشتی نە هاتووم بەڵکو بۆ شمشێر هاتووم .هاتووم تاکو کوڕ لە دژی باوکی جیا بکەمەوە ، کچیش دژی دایکی .**

**( لۆقا ١٢ : ٤٩ – ٥٣ ) هەروا ووتی : هاتووم و ئاگر لەسەر زەوی بکەمەوە ، چیم دەوێ گەر ناچار بوم مردم ؟ وا دەزانن هاتووم ئاشتی لەسەر زەوی بەرپا بکە ؟ نەخێر ، پیتان دەڵێم : بەڵکە بۆ بەش بەش کردن هاتووم ، باوك لەکوڕ و کوڕ لە باوك بەش ببێ .. دایك لە کچ و کچ لەدایك و خەسو لەبوك و بوك لەخەسوی بەش ببێ .**

**( لۆقا ١٩ : ٢٧ ) هەروا وتی : هەریەکێك بێتە لام ، ڕقی (١)لە باوکی و دایکی و خێزانەکەی و منداڵەکانی و خوشك وبراکانی ، تەنانەت لە خودی خۆشی نەبوبێتەوە ، ناکرێ ببێتە قوتابیم.**

# ڕەوشتی مەسیح بە پێی کتێبی پیرۆز

**( لۆقا ١٠ : ٤ ) مەسیح ووتی : لەڕێگا سلاْو لەکەس مەکەن .**

**( لۆقا ١٣ : ٣٢ ) بە ( هیرۆدوس ) ی وتی : بەم ڕێویە بلێن .**

**( مەتتا ٣ : ٧ ) ئەی کوڕانی ئەژدیها ( بڕوانە متی ١٢ : ٣٤ ، لۆقا ٧ : ٣ ) .**

**( مەتتا ٢٣ : ١٧ ) ئەی نەزانی کوێر**

# مەسیح و قوتابیە کانی

**( مەتتا ١٤ : ٣١ )**

---

**بە ( بگرس ) ی ووت : ( بگرس ) ! ئەی کەم ئیمان ، بۆچی گومانتان بۆ دروست بو**

---

١-لە نوسخەی عەرەبی پرۆستانت دا وشەی ( ڕقلێبونەوە یە ) ، بەلاْم لە نوسخەی عەرەبی ( خۆشویستنە ) ..... وەرگێر

( مەتتا ١٦ : ٢٣ )

هەروا ووتی : شەیتان ! لەلام برۆ ، تۆ مایەی هەڵە و هە ڵخلیسکانی منی . تۆ بایەخ نادەی بەوەی کە بۆ خوایە ، بەڵکە بایەخ بەوە دەدەی کە خەڵکی یە ( مرقس ٨ :٢٣ )

( لۆقا ٢٤ : ٢٥ ) بە قوتابیانی ووت : ئەی گەمژە و دڵ کەم ئیمانینە .

## ڕەوشتی مەسیح بەرانبەر بە دایکی

( یوحنا ٢ : ٤ ) مەسیح بە دایکی ووت : ژنێ ! من چیم داوە لە تۆ .

( متی ١٢ : ٤٧ ) یەکێك پێی ووت : ئەوانە دایك و خوشکتن لە دەرەوە وەستاون ، دەخوازن قسەت لەگەڵدا بکەن . ئەویش وەلامی دایەوە ، دایك و براکانم ١ کێن ؟! ( بڕوانە مرقس ٣ : ٣٢ )

---

١-کاتێ ئەم دەقانەی کتێبی پیرۆز تۆمار دەکەم ، من باوەڕ بە ڕاستی و دروستیی ناکەم ، لەبەر ئەوەی من وەك مسوڵمانێك بە سادەیی بڕوا دێنم کە مەسیح بابایەکی خاوەن ڕوەشت بوە ، ناگونجێ و شایستەی نیە ئەم قسانەی پێوە بلکێنرێ ، چونکە مەسیح بە گوێڕایەڵی و چاکەکار بەرانبەر بە دایکی ناوی دەرکربوو ، هەر وەك قورئان فەرمویەتی ﴿ وبراً بوالدتي ولم يجعلني جباراً شقياً ﴾ : گوێ لە مستی دایکیشم بم ، نەشی کردوم بە مل هۆڕێکی سەر بزێو (مریم / ١٩ : ٣٢ ) هەروا مەسیح بەم شێوازە خراپە دایکی نەدواندوە .

# سیفەتەکانی خوا لە کتێبی پیرۆزدا
# یەعقوب زۆرانبازی لەگەڵ خوا دەکات

**( تکوین ٣٢ : ٢٦ – ٣٢ ) کاتێ خوا زۆرانبازیی لەگەڵ یەعقوب کرد ، پێی ووت : بەرم دە چونکە بەیانی داهات .ووتی : بەرت نادەم تا پیرۆزم نەکەیت ، پێی ناوت چیە ؟ ووتی ناوم یعقوب ، خوا ووتی : لێرەوە بەدوا ناوت یەعقوب نیە بەڵکە ناوت ئیسرائیل دەبێت . یەعقوبیش پرسیاری ناوی خوای کرد ، خواش ووتی : بۆچی لەناوم دەپرسی ؟ ئا لەوێ پیرۆزی کرد . یەعقوب بانگی ناوی شوێنی ( فینئیل ) کرد و ووتی : ڕو بەڕو خوام بینی .ئایە خوا مادەیە بگیرێت ئایە خوا ئەوەندە لاوازە مرۆڤ بیکرێت ئایە خوانەی زانی بەندەکەی ناوی چییە؟**

## ئایا خوا ماندو دەبێ ؟؟؟

**( خروج ٣١ : ١٧ ) خوا ئاسمانەکان و زەوی لەشەش ڕۆژ دروست کرد . لە ڕۆژی حەوتەم پشوی داو حەسایەوە**

## خوا وەک سەرخۆش لە خەو هەڵدەستێ

**( مزمور ١٠ : ١٢ ) خودایە هەستە .دەستت بەرز بکەرەوە .هەژاران لەبیر نەکەی . ( خروج ٢ : ٢٤ ) خوا پە یمانەکەی کە لەگەڵ ئیبراهیم بەستبوی ، بەبیری هاتەوە ( تکوین ٨ : ١ ) ئنجا خوا ( نوح ) ی بەبیر هاتەوە . ( مزمور ١٣ : ١ ) خوایە هەتاکەی بەجارێ لەبیرم دەکەی؟ ( مراثي ٥ :٢٠ ) بۆچی بۆ هەتایی لەبیرمان دەکەی ، بەدرێژایی ڕۆژ وازمان لێدێنی** . [١]

## ئایا خوا خەمبار و پەشیمان دەبێتەوە ؟؟

**( تکوین ٦ : ٦ )لەبەر ئەوەی خوا مرۆڤی دروست کرد ، خەمبار بو لە دڵیشدا پەشیمان.بۆوە . ( تکوین ٦ : ٧ ) خوا ووتی : لەبەر ئەوەی دروستم کردن ، بۆیە خەمبار بوم** .

**( خروج ٣٢ : ١٤ ) خوا لەو قسەیە پەشیمان بۆوە کە گوتبوی خراپە بەسەر گەلەکەی دێنێ** .

**( قضاة ٢ : ١٨ ) خوا لەبەر ناڵەناڵیان پەشیمان بۆوە**

---

١- : ئەدی نابێ بابایەکی مەسیحی ژێر پرسیار لە خۆی بکات و بڵێ : ژۆن بڕوا بکەم کە ئەمە چەند دەقێکە لە لایەن خواوە ناردراوە ، کەچی سەرزەنشت و لۆمەی ئاراستە دەکرێ ؟؟

## ئایا خوا نزای ماڵ وێرانبون لە خۆی دەكات

**( ارمیا ١٠ : ١٧ ) خوا بەم شێوەیە ووتی : لە پێناو تێكشكانم هاوار بە ماڵم . زەبر لێدانم بێ چارەیە . ووتم : بەڕاستی ئەمە بەڵایەكە خۆمی لەبەر ڕادەگرم ، خێوەتەكەم تێكچو ، گشت دەماری لەشم پچڕاوە ، نەوەكانم لە دەستم ڕۆشتون .. هاوار بە ماڵم ، وەك پاشماوەی ترێی لێكراوەم لێهاتوە .**

## ئایا خوا فەرمان بە دزیی دەكات ؟!!!

**( خروج ٣ : ٢١ -٢٢ )**

**خوا بە نەوەی ئیسرائیلی ووت : كاتێ بە زەوی فیرعەوندا دەڕۆن ، بەدەست بەتاڵی مەڕۆن ، بەڵكە هەر ژنێك داوای زێر و زیو و جل و بەرگ لە دراوسێكەی بكات ، ئێوەش بە كوڕ و كچەكانتانەوە بكەن ، بەمەش میسری یەكان تاڵان دەكەن .**

**( خروج ١١ : ٢-٣ )**

**پاشان خوا بە موسای ووت : بە گوێی گەل دا بدە کە هەموو پیاو ژنێك داوای زێڕ و زیو لە هاوڕێکەی بکات ، خواش لە چاوی میسریەکان نیعمەتی بە خشیوەتە گەل .**

**( خروج ١٢ : ٣٥ – ٣٦ )**

**نەوەی ئیسرائیلیش پەیڕەوی وتەکەی موسیان کرد ، داوای زێڕ و زیو و جل و بەرگیان لە میسریەکان کرد . خوا لەچاوی میسریەکان نیعمەتی بەخشی . ئەوەبوو میسریەکانیشیان تالاّن کرد .**

## ئایا خوا چەپڵە لێدەدا ؟

**( حزقیا ٢١ : ١٧ )**

**هەروەها منیش چەپڵە لێدەدەم و توڕەیی خۆم دادەمرکێنمەوە .**

**( حزقیا ٢٢ : ١٣ )**

**ها ئەوە من چەپڵەم لێدا** .(١)

# ئێروانینیان بۆ خوا چۆنە ؟

**(٢ صمو ٢٢ : ٧ – ١١ ) دادو ووتی : بەسەر خوا قیژاندم ، ئەویش لە پەیکەرەکەیەوە گوێبیستم بو ، هاوار و قیژەکەم چوە ناو گوێچکەکانی .. دوکەڵێك لە لوتیەوە بەرز بۆوە ، ئاگرێك لە دەمیەوە گڕی گرت ، پشکۆیەك لە لێویەوە داگیرسا ... ئاسمانەکان نەوی بون و دابەزین ، تەم ومژ لە ژێر قاچەکانی بو . سواری دارمێو بو فڕی ، لەسەر باڵی با بینرا . لەبەر تورەیی خوا لە بۆنی لوتی بناغەکانی ( مسکونە ) بەدەر کەوت**

---

١ لەنوسخەی عەرەبی ( NIV ) ئەم دێڕە نیە

# چۆن دەڕواننە بەزەیی خوا

**دایکان گۆشتی منداڵکانیان دەخۆن**

**( مراثي ١٢ : ٢٠ ) خودایە بڕوانە بەکێ ئاوات کردوە ، ئایا ئافرەت بەری منداڵی دایەنگا دەخوات ؟**

**( مراثي ٣ : ١٨ ) متمانە و هیواو ئاواتم بەخوا نەما .**

**( مراثي ٣ : ٤٢ – ٤٥ ) ئێمە گوناه وتاوان مان کرد ، تۆش لێت نەبوردین . خۆم بەتوڕەیی دا پۆشت بەلاّم دەرت کردین . خەڵکم کوشت بە هانامەوە نەهاتیی وبێ بەزەیی بوی . خۆم بەهەور دا پۆشت هەتا نوێژ تەواو نەبێ و کۆتایی نەیێ . لەنێو گەلاندا ئێمەت پیس و چپەڵ کرد .**

**( مراثی ٤ :٤-1 ) لەبەر تینوێتی منداڵی ساوا زمانی بو مەلاّشوی نوساوە .. شێوەیان وەك قەترانی ڕەشی لێهات .. دەستی ئافرەتە سۆزدارەکان منداڵکانیان کردە چێشت و کردیانە خواردنی خۆیان .. خوا ڕق و کینەی تەواو بوو .. توڕەییەکەی هەڵڕژا و لەناو جولەکە ئاگری هەڵگیرساند .**

**( زکر ١ :١٣ ) ئەی خوای سەربازان ! هەتا کەی بەزەییت بە ( اورشەلیم ) دا نایەتەوە .**

**( ایوب ١٢ : ٢١ –٢٥ ) خوا زەبونی بەسەر پیاو ماقولان دادێنێ و ناوچەی بەهێزەکان خاو دەکاتەوە ... نەتەوەکان زۆر دەکات ، ئنجا لە ناویان دەبات . عەقڵی گەلان سەر زەوی ناهێڵێ و سەرگەردان و سەر لێشێواویان دەکات . لە تاریکیدا بە دوای ڕوناکی دەگێڕن و ڕوناکیش دەست ناکەوێ . وەکو سەرخۆشیش سەرزەنشت و لۆمەیەکان دەکات .**

## دوڕویی

**( ٢ صمو ٢٢ : ٢٧ ) لەگەڵ پاکان پاک دەبێ ، لەگەڵ خواروخێچان خواروخێچ دەبێ .**

## ئایا خوا ستەم لە دروستکراوەکانی و بەندەکانی دەکات ؟

**( ایوب ١٩ : ٦ –٨ ) ئەیوب ووتی : خوا خوارو خێچی کردم و بە گوریسی خۆی منی لول وپێچ داوە . ها ئەوە من لەبەر ستەم هاوار دەکەم ، بەلاّم وەلاّمم نادرێتەوە .. داوا بەرز دەکەمەوە بلاّم دادڕەس نیە . ڕێگای گرتوم ناتوانم بپەڕمەوە ، ڕێگاشی تاریک کردووم .**

## داود خۆی بەشێت پیشان دەدات

**( ١ صمو ٢١ : ١٣ – ١٤ ) دادود لە ( جت ) پادشا ترسا ، لەبەر دەمی خەڵك عەقڵی خۆی گۆڕی و لەبەر دەمیان خۆی بەشێت نیشان دا ، دەستی کرد بە تێکدانی دەرگای دوودەری ، لیکیش بەسەر ڕیشی دەچۆڕا .**

## لەبەر دەمی خوا سەما دەکات

**( ٢ صمو ٦ : ٣ –٢١ ) بە پەلە سواری( تابوت ) ی خوا بن ... ( داود ) وگشت ماڵێکی ئیسرائیل بە هەموو جۆرە ئامێرەکان و بە رەبابە و دەفە و ( جنوك ) و ( صنوك ) ە وە لەبەردەم خوا یاریان دەکرد ... داودیش بە هەموو هێزو تواناى خۆی لە بەردەم خوا سەمای کرد ..کاتێ تابوتی خوا هێنرایە شاری( دادود ) ، ( میکال ) ی خێزانی بینی وا لەبەردەم خوا سەما دەکات . ئەویش لە دڵی خۆیدا بە سوکی دانا و بێزاراندی و ووتی : هیچ کاتێ پادشای ئیسرائیل وەك ئەمڕۆ بەڕێز نەبوە کەوا لەبەر چاوی ئافرەتە کۆیلەکانی بەدەردەکەوێ هەروەکو کە یەکێ لە عەقڵ سوکان بەدەردەکەوێ ... ( داودیش ) پێی ووت : بۆ سەر گەلی ئیسرائیل ، خوا منی بەسەر باوکت هەڵبژارد ، جا لە خۆشیان لەبەر دەم خوا سەمام کرد .**

# هاوڕ لە درەختی بنچەی مەسیح (١)

| | بەپێی مەتتا ٦:١ | | بە پێی لۆقا ٢٣:٣ |
|---|---|---|---|
| ١. | داود | | داود |
| ٢. | سليمان | | ناتيان |
| ٣. | رحبعام | | كتانا |
| ٤. | ابيا | | مليا |
| ٥. | أسا | | القا قيم |
| ٦. | يهوشافاط | | يونان |
| ٧. | يورام | | يوسف |
| ٨. | عزيا | | يهوذا |
| ٩. | يوتام | | شمعون |
| ١٠. | أجاز | | لاوى |
| ١١. | حزقيا | | متان |
| ١٢. | منسا | | يوريم |
| ١٣. | امون | | عازر |
| ١٤. | يوشيا | | يوسي |
| ١٥. | يكنيا | | غير |
| ١٦. | شالتنيل | | المودام |
| ١٧ | زربابل | | موسام |
| ١٨ | ابيهود | | ادي |
| ١٩ | الياقيم | | ملكى |
| ٢٠ | عازر | | شالتنيل |
| ٢١ | صادق | | زربابل |
| ٢٢ | اكيم | | ريسا |
| ٢٣ | اليهود | | يوحنا |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| یهوذا | | العازر | ٢٤ |
| یوسف | | متان | ٢٥ |
| شمعی | | یعقوب | ٢٦ |
| متتبا ٢ | | یوسف النجار | ٢٧ |
| | | عیسی | ٢٨ |
| | | مأث | ٢٩ |
| | | نجای | ٣١ |
| | | حسلي | ٣١ |
| | | ناحوم | ٣٢ |
| | | عاموس | ٣٣ |
| | | متتا | ٣٤ |
| | | یوسف | ٣٥ |
| | | نیا | ٣٦ |
| | | ملکی | ٣٧ |
| | | لاوی | ٣٨ |
| | | متات | ٣٩ |
| | | عالي | ٤٠ |
| | | یوسف النجار | ٤١ |
| | | عیسی | ٤٢ |

------------------------------

قسه کانی ١هەندێ گاور( نصاری )هەوڵی پاساوی ئەم هاودژیەیان بە چەندە ها ڕێگە هێناوەتەوە، لەوانە :بنەچەی مەسیح لە ( لۆقا ) دەگەڕێتەوە بۆلای دایکی ،بەلاّم لە ( مەتتا )دە گەڕێتەوە بۆلای ( یوسفی دارتاش ) ی باوکی .کۆکردنەوەی مەریەم و یوسف لە درەختی بنەچەی مەسیح ،تاوانیچکە دەرهەق بە مەریەم دەکرێت،چونکە ئەوکات دەبێتە بەراست دانانی جولەکە کە دەرهەق بەویان وتوە . لەراستیدا ( مەریەم ) ئافرەتێکی داوێن پاکە. پاشان چۆن دەکرێت ( یوسفی دارتاش ) دو ناوی جیا جیا بن بۆ یەك باوك ، کە بە پێی ( مەتتا )ناوە ی( یعقوب )ە و بە پێی ( لۆقا ) ناوی ( هالی )یە ... هەڵبەت یەکیان هەڵەیە ، چونکە سەرچاوەیەکە لەلایەن خواوە نیە.. سەبارەت بەوەی کە یوسف دو باوکی هەبێ ئلئەوە ئەستە مەو مەحاڵە.

٢متتا ١:١٨ ) درەختی بنەچە ی مەسیح ( ٢٧ ) باوك لەخۆدەگرێت

لۆقا٣ :٢٣ ) درەختی بنەچە ی مەسیح ( ٤٢ ) ناو لە خۆدەگرێت کە بە تەواوی جیایە لەوەکەی کە ( متتا )باسیا دە کات

# هاو دژ لەناو فوئابیەکانی مەسیح دا

| | متی ۱۰:۲ و مەرقس ۳:۱٦ | | لۆقا ٦:١٤ |
|---|---|---|---|
| ۱ | سەمعانی قانونی | | سەمعانی ناونراوە بە بطرس |
| ۲ | سەمعان ناونراوە بە بطرس | | سەمعانی بەغیرەت |
| ۳ | ئەندراوس | | ئەندراوس |
| ٤ | یوعقوبی کوڕی زبدی | | یوعقوبی کوڕی زبدی |
| ٥ | یۆحننا | | فیلیبس |
| ٦ | فیلیبس | | برثلماوس |
| ۷ | برثلماوس | | متی |
| ۸ | متی | | تۆما |
| ۹ | تۆما | | یۆحننا |
| ۱۰ | یوعقوبیکوڕی حەلفی | | یوعقوبی کوڕی حەلفی |
| ۱۱ | لباوس ناوبراو بە تداوس | | یە هوذای برای یەعقوب |
| ۱۲ | یەهوذای ئەسخریوطی | | یە هوذایئە سخریوطی ( ۱) |

---

۱( متی ۱:۱٦ ) یوسفی دارتاش کوڕی یەعقوبە.

( لۆقا۳:۲۳ ) یوسفی دارتاش کوڕی هلی یە.

( متی ) و ( مرقس ) و ( لباوس ) و ( سەمعانی قانونی ) یان زیادیان کردوە سەمعانی بەغیرەت و( یە هوژای )ی برای یەعقوبیان لا بردوە ،کەچی ( لۆقا )ی سەمعانی بەغیرەت و یە هوژای برای یەعقوبی زیاد کراوەو ،( لباوس )و سەمعانی قانونی لابردوە.

# گۆڕانی مرەکەبی سور بوسپی(١) یوحننا
## ١٢:١٧

| | |
|---|---|
| k.j.v | ئەو شتەی پێت دام ( بەرەنگی سور ) هیچیانم فڕنەکرد |
| l.b.v | ئەو شتەی پێت دام ( بەرەنگی رەش ) هیچیانم فڕنەکرد |

# کتێبی خەونی یوحننا ی لاهوتی

**ئەم کتێبە گشت وشەکانی بەرەنگی سور لابراوە،٢ پاشان دوبارە**

---

١ -هەندێ وەرگێراوی کتێبی پیرۆز وشەی ( مەسیح ) بەڕەنگی سور لە وتەی کەسانی ترجیا دەکاتەوە ( تەنانەت لە وتەی خواش جیادەکاتەوە ) ئەگەر تەماشای وتەی خوابکەین دەبینین بەڕەنگی ڕەش نوسراوە .ئەگەر تەماشایی وتەی مەسیح بکەین دبینین بەرەنگی سور نوسراوە ئەمەش گەورەترین بەلگەیە لەسەر پوچەڵی سێ خوا ( الثالوث ) وەتەنها یەك خوا هەیە . گەر ئەو سێ خوایە یەك بن ئەبوایە وتەی هەر سێکیان بەیەك ڕەنگ بنوسرایە.

٢ ڕەنگە ئەمە ئەوە بێ کەئەم کتێبە خەونی زۆری لە ڕادەبەدەر دەگیپڕێتەوە ،ئەوەش بوە مایەی ئەوەی چەند زانایەکی مەسیحی لەکتیپبی پیرۆز لاییدەن .لەبەر ئەوەی قسەکە قسەکە لەکاتی نوستن بوە نەك لەکاتی بەخەبەر بون ،هەندێ مەسیحی بەقسەی ڕاستەقینەی مەسیحی دادەنێن .هەندیکیان بە ناوزەد کردنی مەسیح لەم کتێبەدا بە ( بەرخ –خروف ) و وێناکردنی مەسیح لەسەر شێوەی بەرخی خاوەن حەوت قۆچ هەراسان بون . ئالێرەوە جاڕی لابردنیان دا.

# یوحنا ٦:٣ (لەوشەی لەدایك بون یەشیمان بونەوە
# BEGOTTEN

| | |
|---|---|
| K.J.V | **ئا بەم شێوەیە خوا جیهانی خۆشویست هەتا منداڵە تاقانەکەی خوابەخشی.** (١) |
| R.S.V | **ئا بەم شێوەیە خوا جیهانی خۆشویست هەتا کوڕە تاقانەکەی خوای بەخشی.** |
| N.I.V | **ئا بەم شێوەیە خوا جیهانی خۆشویست هەتا کوڕە تاقانەکەی خوای بەخشی.** |
| G.N.B | **ئا بەم شێوەیە خوا جیهانی خۆشویست هەتا کوڕە ( جیاکەرەوەکەی ) بەخشی.** |
| L.B.V | **ئا بەم شێوەیە خوا جیهانی خۆشویست هەتا لەدایك بوە تاقانەکەی بەخشیی**( ٢ ) |

---

**١- پوختە کارانی نوسخەی** N.I.V **تێبینیان کرد کەوا وشەی لەدایك بون( مولود )نابێ بدرێتە پاڵ هیچ کەسێکی تر جگە لە مەسیح ، چونکە بە پێی ( یوحنا ) مەسیح تاکە ڕۆڵەی لەدایك بوی خوایە ( یوحنا ٣ :١٦ ) هەروەها تێبینیان کردوە داود لەم سیفەتە دا بەشداری دەکات ( مزامیر٢ :٧ )داود گوتی : خوا پێی وتم : تۆ کوڕی منی ، ئەمڕۆ تۆم لەدایك بوە جابە گوێرەی ئەمە خوا دوو لە دایك بو( کوڕ ) ی هەیە و دوو ژنیشی هەیە جالە پێناو نەهێشتنی ئەم کارە تەنگژەیە و خۆ دەربازکردن لە رەخنەکاریی ، ڕێیان بەخۆیان دا دەسکاری دەقەکە**

**بکەن لەسەر ئەو شێوەیەی کەلەسەرەوەدیبینن ..دیارە ئەمەش مایەی سەرنجی هۆشمەندانە بۆ چۆنیەتی گۆڕینی وشەی خوا لەلایەن قەڵەم بەدەستە درۆزنەکان ، هەروەك ( أرمیا ) شایەتی ئەمەی دوە( ٨ :٨ ارمیا )**

**٢_ئابەم شێوەیە دوای ڕەخنە گرتنی گەواهیدەرە توندەکانی ( یهوە )لەسەر ئەو نوسخانەی کەلەبەردەستی کاسۆلیك و پرۆستانت و لقەکانی ، بڕیاریاندا وشەی** BEGOTTEN **لەنوسخەی نوێیە کانی ( یهوە )** N.W.T **دوبارە بکەنەوە ئەم وشەیەش لەو پە نجا هەزار هەڵەیە دانەنرا کەلە نوسخەکانی تر ژماردیان.**

## سەرچاوەکان

١-قورئانی پیروز.............................................................
٢-پە یمانی کۆن ( ٧٧ ) کتێب.......................................................
٣-پە یمانی نویٚ ( ٢٧ ) کتێب.......................................
٤-ئایا کتیبی پیرۆز وتەی خوایە ( د.ئەحمد دیدات ) وە رگێرانی کوردی........
٥-باکتێبی پیرۆز بدویٚ ( عبد ل الرحمن الدمشقیه ) وە رگیرانی کوردی ........
٦-بە پێی ئینجیل و تەورات ( محمد د.خ ) پێغەمبەری خودایە ( د.ئەحمد دیدات ) وەرگێرنی کوردی................
٧-مقارنات الادیان(الامام محمد ابو زوهره ) عەرەبی ......................
٨-الوجه الاخر للمسیح ( فراسالسواح ) عەرەبی...........................
٩-فەلسەفەی لاهوت ( د.حەمید عزیز ) کوردی ........................
١٠-چیرۆکی ئاینەکان ( سلێمان مەزهەر ) وە رکیرانی کوردی ...............
١١- چاکسازی ئاین ( سارا فلووەرن ) کوردی..............................
١٢-ئاین چیه ( عادل باخەوان ) کوردی ...............................
١٣-ئینجیل پێنجەم ( نیچە ) عەرەبی ................................
١٤- دواهەمین کوفرەکانی نیچە ( فەردین دارا ) وەرگێرانی کوردی
١٥- نیچە و مەسیحیەت ( کارل یسپرس ) وەرگێرانی کوردی ....................
١٦- مەکتوباتی کاك ئەحمەدی شێخ ( مەلا عبدول کریم مودەریس ) بەرگی یەکەم
١٧- ژیانی عیسا پێغەمبەر ( مامۆستا ناسح محمد شارباژێری ) ...........
١٨-( التحریف والتنا قض في الا ناجیل الاربعةً ) عەرەبی............
١٩- پێگەی ئینتەرنێت
( http://arabic.islamicweb.com/christianity/conflicts_in_bible.htm )

# سوپاسو پێزانین

# بۆ

# هەموو ئەو بەڕێزانەی کە هاوکاریان کرد